ئەگەر ڕۆژ دێتە دەرێ لە قوللە و قول و بورج و پەنجەران لە بورجێ بەڵەک شەبەقێ خۆی دەدان لەوان بلێند و نەوییە

لاس دێتە سەر قوللە و بورج و پەنجەران، دەڕوانێ بەحوکمی دووربینێ، لە دوایە دەخورێتە مەتبەر و میر ئاخوڕان بۆی دێننە دەرێ کوێتێکی قاپ ڕەشی ئاو بڕی سەر بەژەنگاری لەوی ئەسلە بەحرییە

لە پشتی کوتاوە زینێکی مورساییە. بەتەنیشتی دا بەرداونەوە جووتێک ئاوزەنگی ئاودەست کارییە

تەنگە و بەرتەنگەی بولغارە و لغاوی مروارییە

لە پێش گوێیە مایینی قایم کردووە قولێک پەری نێر تاوسێ سەریان لە گەواڵی دەهەورییە، لەسەر دەستی داناوە بازێکی سێ تووکی سێ قەلاتی لەوی تینوو و برسییە،

لە پێشکۆیە زینی داناوە ڕمبێکی هەژدە قەفی لەوی سەر بەنسیرییە

ئەمما بەتەنیشتیدا بەرداوەتەوە شیرێکی لاهوری لەوی کۆسە میسرییە دەشانی دایە کەوانکێ خاسە ڕەنگ دەگەڵ سەد و بیست و چوار تیری سەر بەژەهرەمارییە

بەدەستەوەیەتی مەتاڵێکی کەرگەدەنی تیۆنەبری لەوی پێستی لە خورییە

ئەمما لەبەریدا زرێیەکی ئاڵقە ئاڵقەی لەوی ئەسلە داوودییە

بەسەرێوەیەتی جووتێک شەدەی فەرەجولاهی لەوی ئەسڵە کوڕ حوسێنییە

لەبەریدایە کەوا و پاتۆڵێکی ئەسکەنە هەر گەزی لە پێنسەد زێڕی کەمتر نییە

لە پشتیدا پشتێندێکی شاڵی تورمەی لەوی ئەسڵە ئەستەمبوڵییە

لەبەر پشتێنی چەقاندووە خەنجەرێکی قەرە خوڕاسانی لەوی دەسک نێرویە

هەڵی کێشاوە جووتێک چەکمەی بریقەداری لەوی عەسڵە حامیدییە

ساتاغەی هاتوونە خوارێ هێندێک کورتن، هێندێک درێژن هێندێک شۆرابەیان لە عەرزییە

لە قۆڵیدا جووتێک تاجی هەلاتی هەنی موو دوورکوژی لەوی دەمایردییە

ئەمما بەدایم لە دوای دەڕۆن دوو سەد سواری، سەدی جحێڵە و سەدی ڕدێن سپییە

هەڵدەستێنێ پۆڕێ کەتی دەگەڵ دەعبای دەکێویییە





کلاوی بەلای سەرێوە، خۆفی خودای نەبێ قە خۆفی هیچ عەبدانی لە کن نییە

خەزاڵ بەسەری تۆ ئەوە لە دە بەشانم بەشێکی مەدحی لاسە شۆڕی باڵەکی عەرزی تۆ کرد بەسەر زیانییە

دەزانی پیرم و بێ تاقەتم، چیدێکەم تاقە نییە.

**

بەڵێ، ئەگەر کابرا قامەکەی بۆ خەزاڵی گو ، خەزاڵ پێی گو : قەراری من و تۆ ئەوەبێ بەوەعدی پازدە ڕۆژی دی ئەتۆ لاسم بۆ بنێریە ئێرە، ئەمن دوو ماینانیشت بۆ زین و لغاو دەکەم لەباتی ماینی خۆی بۆی بەرەوە. جا سبحەینێ دوو ماینی حازرکردن، کابرا سوار بوو ڕۆیی. کاتێ گەیشتەوە نیزیک ئاوایی، لاس لەسەر بورجێ ڕاوەستابوو تەماشای کرد دوو سوار وەدەرکەوتن، زانی پیاوەکانی خۆنی ئەمما ولاغەکان نا. گوتی داخودا لە کوێ بەسۆغرەیان گرتووە یان دزیویانە یان فڕاندوویانن. کە گەیشتنەوە و دابەزین، لاس لێی پرسین، کابرا گوتی: بڕۆ ماڵ خەراپێ ئاگا لە خۆ نەماوی کەللە زل خان، عاشقایەتیم بۆ دەگەڵ خانزادە خانێ هەریری دەکەی! نازانی ماینی تۆ پیاوی خەزاڵە شۆڕێ مەلا نەبیان بردوونی؟ خەزاڵە شۆڕ نەقلی وایە و حاڵی وایە و........، چەند ئاشقی لە دەورەنە، بەڵام کە باسی تۆی لە دەروێشی زانیبوو ئەوجا بەجارێکی حاڵی نەما ئەو دوو ماینەشی لەباتی ماینەکانی خۆ بۆ ناردووی، قەراریشم دەگەڵ داناوە بەوەعدی پازدە ڕۆژی ئەتۆ بچیەوێ. جا دەڵێ، لاس گوتی چۆن بچم، بەلەشکرەوە بچم؟

یەک دەیگو تالانی دەکەین، یەک دەیگو ئەوی لە دەورەیەتی دەیکوژین، بەڵام پیاوێکی پیر کە خزمەتی ئەحمەد ئاغای دەکرد گوتی: ئەتۆ هەستی لەشکرکێشی بکەی و، بچێ وێ تووشی هەرا دەبی، پیاوێکت لێ بکوژرێ سەد خەزاڵی دێنێ، ئەتو بۆ خۆ لیباسێکی کەسیف و شڕووڕی شوانانە لەبەر بکە و بڕۆ کەمبەربەندێکی ئاڵتون لە هەزار زێڕی لە پشتێ ببەستە بۆ تەنگانان پێت بێ، ئەگەر پیاو بی لەو لیباسەشدا پیاوەتی خۆ دەکەی، ئەگەر چشت پێ نەکرا ئەوا دێیەوە ماڵەخۆ کەس ناڵێ لاس چۆتەوێ.

لاس گوتی: ئەتۆ لە جێی من بە، هەر کەس بەبێ فەرمانت جوولاوە کای لە پێستی داخنم.

جا دەڵێ، لاس جووتە کەلاشێکی هەورامانی لە پێ کرد و، ڕانکوچۆغەڵێکی بۆرەکە

تەپلێکی کوردانەی لبادی لە سەر نا و ئاغابانوێکی لەسەر بەست و، دەستی دا گۆچانێکی بەڕوو، دوو سێ نانیشی لە باغەڵی نا و، لێیدا و ڕۆیی. وەختایەکی ئەگەر گەیشتەوێ، بەپرسیار هۆبە و هەواری خەزاڵی دیتەوە چۆ تاوڵێکی گەورە کە لە نێو تاوڵان هەڵدرابوو، لەبن لاپانکی دەرێ دانیشت نەچووە ژوورێ. کابرای ساحەب ماڵ لێی پرسی: ها کوڕە لە چی دەگەڕێی؟ گوتی: وەڵا شوانی بێ، بەربەرخان بێ، ئەو جۆرە شتانە دەکەم. کابرا لەبەر خۆیەوە گوتی ئەو پەل ئەستوورە بۆ مەلا نەبی چاکە هەربۆیەش وەدوای خۆی دا و بردی بۆ لای مەلا نەبی، گوتی ئەوە چییە؟ کابرا گوتی ئەوە شوانی دەکا. گوتی بیبەنە کن خەزاڵێ با بینێریتە بەرغەڵی، شوانی بەرغەڵی نییە. بردیانە کن خەزاڵێ، خەزاڵیش وەک تاوسی مەست چەتری ئەنگاوتبوو لەبەر دەرکی چادرێ ڕاوەستابوو. کە لاس چاوی پێ کەوت لە قامکی پێی ڕا تێی فکری تا تەوقی سەری لە هیچ کوێدا عەیبی نەدیت. خەزاڵ گوتی ئەوە چییە؟ کابرا گوتی ئەوە مەلا نەبی ناردوویەتی بینێریە بەرغەڵی.

گوتی کەوابوو نانی بۆ تێنێن با بڕوا وە دووی بەرغەڵێ کەوێ، هیچ ئەهەمیەتێکی پێ نەدا چونکە لە لیباسی شڕوشەوێق دابوو...... دەڵێ چۆ بەر بەرغەڵێ ڕۆژێکی وا، دوان وا......... لەولاشەوە خەزاڵ قاسیدێکی لەڕێیە بەندەن و شەقامان دانا داخوا لە کوێڕا لەشکری لاسی وەدەر دەکەوێ، لاس لە کوێڕا دێ لە حاڵێکا لاسیش ئەوە لەبن هەنگڵی خۆیەتی و ناشزانێ هەربۆیەش چاوەڕوانییەکەی بەخۆڕایی بوو، لەشکری لاسی لە بیستی نەبوو، لە بیست و پێنجی نەبوو پاش مانگێک هەر نەبوو. ڕۆژێکی داریان نەمابوو گوتی کوردەی بگێڕنەوە لە بەرغەڵێ با بچێ کۆڵە دارێکی بێنێ.

کوردەیان گێڕاوە، گوریسێکیان دا دەستی وەک گوریسی عارەبەی سێزدە باڵی. ڕۆیی بۆ بەندەنێ، نە تەپشۆ و، نە تەورداس و نە بیوری پێ نەبوو، سپیە گوێنی کوێستانێ ئەگەر ڕۆی دەبۆیە ئەوەندەی لق و پۆپی بەسەرەوە بوو ئەوەندەشی لە ڕەگ و ڕیشەوە دەهێنا دەرێ. کۆڵەکەی لێنا و............. وتیلەکەی نەگەییە تەک بەندەکەی لە پشتی کردەوە و لەبن لیباسی هێنایە دەرێ و، دەسەر گوریسەکەی خست. کە هاتەوە لە پشت چادرێ کۆڵەکەکەی دانا، قەرەواشێکی خەزاڵێ چاوی بەو تەک بەندەی کەوت کە لاس لە سەری گوریسێی کردەوە و لە پشتی خۆی بەستەوە. ئەو قسەی بە خەزاڵێ گوت.

خەزاڵ شکی لێ پەدا بوو، گوتی ئەوشۆ دەیکەمە گەڕەلاوژە، شوان و گاوان و مسکێن، ئاشق، چاک و خراپ لەڕیزیان دەدەم، کوردەش لە تەنیشت خۆم دادەنێم هەر





کەس بەندی خۆی بڵێ. ئەمنیش بەندی خۆم دەڵێم، ئەگەر لاس بێ دەتوانێ جوابم بداتەوە ئەگەریش لاس نەبێ با گەلێکی بخوا و گەلێکیش شوانی بکا.

جا دەڵێ شەوێ گەڕەلاوژەی دامەزراند و هەر کەس بەندی خۆی گوت ئەوجار نۆرە گەیشتە خەزاڵێ، خەزاڵ دەستی پێکرد ئەوە کوردەش لە تەنیشتی دانیشتووە کە ئەگەر نۆرەی گەیشتێ وەڵامی بداتەوە. جا دەستی پێکرد:

بەڵام کێ بوو لە خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیە دەڵێ

سەرم لە ئێشە و دڵم لەگرێیە، قایمەتی لەگرێ گرێیە

سەری کوێستانان بە تەمە ڕۆی دە ڕووناکی نییە

دڵی من چەندی لە خەمە، چەندی لە ئێشە قەت تاوێکی ڕووی دەخۆشی نییە

ئەمن قەول و قەرارم دانابوو دەگەڵ مامێ ڕدێن سپییە

بەوەعدەی پازدە ڕۆژان قاسیدم داناوە لە ڕێیان، لە شەقامان لەوان بڵێند و نەوییە

ئەو لاسەی ئەمن لێی دەپرسم کوڕی ئەحمەد ئاغای شارەزوورییە لە هیچ وڵاتان سەر و سۆراغی نییە

ئەمن دەبەرم دایە کراسێکی مەڵحەم کەتانی دارایییە

ئەمما لەبن ئەو کراسەی پاوانم کردبوون جوتێک زەردەبەییە

بەو خودایەی بێ شەریک و مەکانە دەستی هیچ کەسی وێ نەکەوتییە

دەبەرۆکێمدا سەد و بیست و چوار دوگمەی دوڕن، لەعلن، مەرجانن، یاقووتن هیندە بودەباغەڵییە

جا کوردە بەشقی خودای ئەگەر ئەتۆ لاسی وەرە دە حەدەحەدی نیوە شەوێدا هەڵگرە دوگمەی بەرۆکێم لەنێو سینگ و مەمکی من، بکەوە بەزم و ڕەزم و کەیف و سیاحەتێ ئەگەر ئەتۆ لاس نی سبەینێ سەری خۆت هەڵگرە چ کارم بەشوان و بەرخەوانی تۆ نییە.

**

بەڵێ ئەگەر خەزاڵ بەندی خۆی گوت، گوتیان کوردە دەی ئەتۆش بیڵێ. کوردە گوتی: بابە ئەمن هیچ نازانم ئەمن هەر شوانی و بەرخەوانی و شتی وا دەزانم، کەنگێ ئەمن قامم گوتووە؟ چ نازانم.

خەزاڵ گوتی ئەوە گەڕەلاوژەیە، دەبێ هەر کەسە و بەندی خۆی بڵێ. گوتی جا ئاخر ئەمن چ نازانم (لاس دەستی خۆی وەپێش خست) گوتی مەگەر بڵێم خەزاڵ و، ئاشقێ

و ماڵە مەلا نەبی، ئەوەی لەبەر چاومە لەوانە بلێیم. ئەگەر ئەوانەش بلێیم مەعلووم نییە ئەو ئاشقانە بەگوریسان کوێرم نەکەن. خەزاڵ گوتی ئەتۆ پیاوی من نی؟ هەر کەس گوڵیشت پێدادا خەراپی پێ دەکەم بەکەیفی خۆتی بلێ.

ئینجا لاس هەستا، دەستی پێکرد و گوتی:

ئەمما هەر لە ماڵی دەمەلایان هەتا ماڵی دەسۆفیان،

لە ماڵی دەسۆفیان هەتا ماڵی دەحاجیان،

هەر لە ماڵی دەحاجیان هەتا ماڵی دەزوودیان،

هەر لە ماڵی دەزوودیان هەتا ماڵی دەسورچیان،

هەر لە ماڵی دەسورچیان هەتا ماڵی دەخەزاڵو، خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیان،

سەدبرێ بە بەرێ خودای با ئەمن ڕستێ بام بەدارێک و نەمامێکی لەوێ دەقەیسییە، شین ببام لە کەندان و لەندان و، ئەمما کوریلکە، کوریلکە دەزەویان، تەماحیان تێکردبام و بڕیبایانم ئەمما بیاندامە دەستی وەستایەکی دەست پەسەندی کار چاکی لەوێ دەجووندییە.

بیاندابامە بەردەمی ڕەندە و خۆشتەریان بیکردبام بەتیرێکی خاسەڕەنگ، وێیان خستبام پەیکانێکی سەر بەژەهرەی مارییە.

بیاندابام بەدەست ڕاوچێکی بەڵەد بەقووەتی باسکان، بەهێزی دەستان بەحوکمی چاوان هەڵیدابام بۆ زارگەڵێ گۆرانگان سەری کێلەشینێ، قۆچی قەزەنی، حەسارێ سەکران، کۆرێ سەرسووری، بەردی تەشی ڕێسان لەوێ پێیان کوشتبام دایکی بەران و پیرەنێری کێویان.

لەوێ کەوتبام حەوت ساڵان لەسەر کەڵەک و ڕەمەند و بەردی دەشاڵە بەگییە. لەدوایە بەسەرمدا هاتبان عێلی میر عەزیز و میر بداغ و، ئەحمەد ئاغای دەسورچیان کیژۆڵەی ناسک بەدەن و شل و مل و کەڵەگەت و چاو بەکل و مەمک خڕ و، پەنجە شمشاڵ و ڕووبەخاڵ، بەپەنجەی ناسک و پڕ ئەنگوستیلە هەڵیانگرتبامایەوە و، بەدیارییان هێنابام بۆ خەزاڵ و، خەزاڵە شۆڕێ مەلا نەبییە.

خەزاڵیش بڕێکم تێ فکریبا بەوان دەڕەش بەنگیان لەدوایە بیدابام بەدەست وەستایەکی ئیش پەسەندی کار چاکی لەوی دەهیندییان ئەویش بیکردبام بەکلکە تەشێکی خاسەڕەنگ، وێی خستبام سەرێکی خڕنۆکی لەوی دەگا کێوییان.





بیاندابام بەدەست ژنەدۆمێکی گەڕیدەی کراس شینکەی بێ حەیای لەوی گەرمێنیان، بیگێڕابام هۆبە بەهۆبە و، وڵات بە وڵات و، ماڵ بە ماڵ دەخێڵەکیان.

بەهیچ کەس نەکڕابام هەر خەزال خۆی بیکڕیبام بەوان وردە ئەشرەفیان

حەوت ساڵان بەڕانی نەرم و لووسی پێی ڕستبام ڕانکوچۆغەڵێکی کوڕە میر توتیان،

پاش حەو ساڵان بەتەنێ پێی ڕستبام ڕانکوچۆغەڵێکی کوڕە باڵەکیان.

ئەمما لەدوایە ڕقی لێ هەستابام، وەبەر ناڵچەی کەوشی دابام بەدوو لەتی کردبام هەڵیدابام بۆ سەری بەستۆڵی مێرگە خڕکەڵەی، مێرگە چووکەڵەی مێرگە پانکەڵەی قەبری مەڕی مۆڵی بەرخان، لەوێ کەوتبام لەوان بلێند و نەوییان،

پاش حەوت ساڵان ئیشکارۆ بام، هەڵی کردبا کزێک بایێ شەماڵی وردە وردە نەرم و نەرم دایگێڕابام بۆ چێنکە چێنکەی دەئاوێ ناوەڵا گەیبامە سەر تاتی دەکانیاوان لەوێ تەرەوبنی ئاوێم وێ کەوتبایە، بەحوکمی پادشای لەسەر ئەوێ ڕستابام بەدارێک و نەمامێکی لەوی شۆڕەبیان

شۆرابەم هاتبانە خوارێ، دامگرتبا کەندان و گۆڕان و، ئەمما گۆڕیلکە و گۆڕیلکە و جێ هەواری دەقەدیمییە

لەبن لکێکم دانیشتبان کراس ڕەش و چارۆکە سپی دەزوودیان

لەبن لکێکم دانیشتبان ئاڵقە زێڕ و گوارە زێڕی پشدەریان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان لەرزانەداری شینکێ و ئالانیە

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان کەڵەگەت و پشتێند شل و چاو بەکلی سوێسنی و سەردەشتیان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان شەدە بەسەر و دراو لەبەرۆکێ بانەییان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان ساسا و هێن هینێ دەژنە سەقزیان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان چاوڕەشکەڵە و خرکەڵە خرکەڵە بۆکانی و مەحاڵێیان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان بووزەڵێ لەبەروو، کەڵەگەت و چاو بەکلی شاروێرانیان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان سایە لەبەری دەبلێباسان دەگەڵ تاس بەسەری دەهەرکیان

لەبن لکی دیکەم دانیشتبان بەتاقی تەنێ خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیان

خەزاڵ بەسەری تو سوڵحی بیست و چوار دەوڵەتان کرا تازە سوڵحی من و بابە ڕدێن شینەکەت ناکرێ لەسەر ئەوان چوار ڕۆژە بەرخەوانیان.

**

جا خەزاڵ گوتی ئەوە نێوم لێ گۆڕی هەر کەس پێی بڵێ کوردە جەریمەی دەکەم، ئەوە نێوی شوانە بچکەڵەیە، نابی بچیتە بەر مەڕ و بەرغەڵیش. شەوێ زۆر وریابە، دەبێ لەبەر دەرکی چادری من ئامانەتی ماڵ بێ. ئاگام لێیە ئەگەر شەوێ سەگ دەوەڕێ دەردەپەڕێ.

بەو جۆرە بڵاویان کرد و هەر کەسەی ڕۆیەوە بۆ مزڵی خۆی، ئەوێ شەوێ لاسیان هێنا بۆ تاوڵی خەزاڵێ. ئەو قاپووتەی لەبەر دابوو کە پێی دەچۆ بەرغەڵێ سەری وەسەر گوێچکی کرد و لێی ڕاکشا.

لاس دەدڵی خۆیدا گوتی ئەمن وڵاتی باڵەکان و حوکمات و ئاغایەتی خۆ بەجێ بێڵم، ئەمن شوانی و بەرخەوانی بۆ بکەم، چۆن هەر خۆشم بچمە سەرجێی وی؟ قەراربێ هەتا سووچی قاپووتەکەی هەڵنەداتەوە و خۆم دەباڵ نەکێشێ ئەمن نەچمە کنی و خۆی تێ نەگەیێنم.

خەزاڵ وردە نەخۆشییەکی هێنا خۆی بۆ خاتری وەی خەوی لێ نەکەوێ، جارێک بەدوان، جارێک بەسێیان دەیان شێلا، قەرەواشان دەیانشێلا هەر چاوەڕێی وەی بوو ئەگەر لاسی بێتە کنی و هەستێ لێی بپرسێ. پاشان بەقەرەواش و کارەکەرانی گوت: هەر کەسە بڕوا لە مزڵی خۆی بنوێ منیش بزانم برێکم خەو لێ ناکەوێ. ئەوان ڕۆیشتن، خەزاڵیش هەستا بەعینوانی نەخۆشی، کە نەخۆش ورتە ورتێکی دەکا و بۆ خۆی شتێکی دەڵێ، گوتی با بە بەندێکی بانگ کەمێ لەسەر خۆ بزانم، ڕەنگە خەوی لێ کەوتبێ بەڵکو وەخەبەر بێ:

بەڵێ جا بانگی کرد:

دەڵێ کێ بوو لەبەر خەزاڵە شۆڕ و خەزاڵە شۆڕێ مەلا نەبییە

دەڵێ سەرم لە ئێشە دڵم لەگرێیە قایمەتی لەگرێ گرێیە

ئەوشۆ نەخۆشم جارێک دەمشێلن بەدووان، جارێک بەسێیان جارێک بەچواران ئێشی بەدڵی من هێدی نییە

ئەرێ شوانە بچکەڵەی ماڵ بەقوڕێ گیراو ئەتۆ شەوان چەندە وریا بووی لەکەوانەی دەمەڕییە





ئەوشۆ جارێکی سەر هەڵناهێنی جارێکی بپرسی لەمنی قەلەندەر و قەت کەس نەماو، بزانی حاڵ و ئەحواڵی من هەرچییە.

**

لاس سەری هەڵنەهێنا، خەزاڵ هەراسان بوو هەستا پێیەکی لێناو چۆ دەرێ، ئەگەر ڕۆیە دەرێ ڕووی لەولایەی بوو کە هاتەوە ڕووی لە پشتەوەکەی کردبوو. خۆی دەباڵ کێشا و، گوتی لەڕووی نابەڵەدیەوە نەمناسێوە ئەتۆش بەو لیباسە کەسیفەیەوە هاتووی دەبێ قسووریم عافووکەی. هەر چەندە خەزاڵ ئەوبەر ئەوبەری کرد بەڵام لاس گوتی: پێت وایە ئەمن وڵاتی باڵەکانم بەجێهێشتووە، شوانی و بەرخەوانی بۆ تۆ بکەم، بەهەر حاڵ ئەوێ شەوێ لەوێیان گوزەراند، حەوت ڕۆژان لە ژوورێ نەهاتە دەرێ. جا ئەو ئاشقی ئەگەر لەوێ بوون ئێوارە و ئێوارە لەو گوڵانەی کە شوانان لەبەندەنێرا بۆ خەزاڵیان دەهێنا، دەسکە گوڵێکی بۆ ئەو ئاشقانە دەنارد.

جاسووسان خەبەریان بەعاشقان دا، گوتیان، بابە خەزاڵ کوردێکی لەسەرە خۆی دابەستووە، شەوانە دەگەڵ کوردەی بەزم و ڕەزمی خۆی دەکا.

ئاشقان ئەگەر بەو حاڵەیان زانی ناردیانە لای مەلا نەبی، گوتیان ئەمە ماڵ و دەوڵەتی خۆ سەرف دەکەین دێینە ئەمانەداری تاوڵ و چیغی تۆ، ئێستاش کچەکەت کوردێکی لەسەر خۆی دابەستووە و، ئەمەی هەر لەبیر چۆتەوە. مەلا نەبی لەو بابەتەوە ناردییە کن خەزاڵێ.

خەزاڵیش تەگبیری بە لاسی کرد. لاس گوتی هیچ کارێکی گران نییە، بنێرە ئاشق بێن قەرارێ بکەن سێڵی مەفرەق دەلبادی بدروون بەسێ پەلکی مەشکەیەوە هەڵاوەسن ئاشقان تیرەندازی لێ بکەن هەرچی تیری لەو سێڵە ڕۆییە دەرێ ئەوە ئاشقی بەڕاستییە و، دەمێنێتەوە هەرچی تیری نەڕۆییە دەرێ لێرە بڕوا. ئاشقانیش ئەگەر ئەوەیان زانی زۆریان پێ خۆش بوو، گوتیان، جا سێڵ چییە بەتیری وای لێدەکەین هەمووی کون کون بێ. بەڵێ عاشقان ڕیزبوون تاکو تیرەندازی لە سێڵی مەفرەق بکەن، لاسیش لەولایڕا هات مەلا نەبی و مەلا داوود کە برابوون، هەرچی مەلا نەبی بوو سێ کچی بوو، ڕابی و خۆبی و خەزاڵ. خەزاڵ لە هەرکان چووکتر بوو کوڕێکیشی هەبوو نێوی فەقێ برایم بوو. مەلا داوودیش کوڕ و کچێکی بوو نێوی ئەستی بوو کوڕەکەشی نێوی خدربوو، لەسەر پشتی لانکێ خەزاڵیان لە خدری مەلا داوودی مارە کردبوو ئەستیشیان لە فەقێ برایمی کوڕی مەلا نەبی مارەکردبوو بەڵام لەبەر زاڵم و زۆردار و سەردار عەشیرەتان و لەبەر ئەو ئاشقانە نەیاندەوێرا وەیانگوێزن. ئەوان مەلازادە و بێ دەسەڵات بوون هەموو لەسەیری

تیرەندازی ڕاوەستابوون دەو دەمەیدا لاس هات چووە کن ئەستی و خەزاڵێ. گوتی بۆچی تیر و کەوانێکیش نادەن بەمن تاکو ئەمنیش تیرێکی باوێم.

خەزاڵ بەتەوسەوە پێی گوت: ئەتو کەنگیت تیر هاوێشتووە هەر شوانی و بەرخەوانی و شتی وات کردووە.

لاس گوتی خۆ زەرەدی نییە. ئاشقانیش هەر تیریان داوێشتە سێلێ بەڵام چیان بە چ نەدەکرد و تیردانیان تیری لێ خەڵاس بوو خێندەی باوێنێ و تیریش ئەسەرێکی نەبوو، ئی وا بوو لبادەکەی دەبڕی و ئی واش بوو یا هەر نەیدەبڕی یان هەر نەیدەنگاوت.

مەلا داوود تیروکەوانێکی عاجی هەبوو ناردیان بۆ کوردەیان هێنا. کوردە چووە پشت عاشقان گوتی لاچن لەسەر ڕێیە، مەیدانێک دوور لەوان بوو عاشقان گوتیان ئەو کوردە شێت بووە و هەوای خەزاڵی لە کەللەی داوە، هێندە بێ عاقڵە خۆی بەکوشت دەدا. هێندێکیش تێگەیشتبوون، گوتیان نەخێر ئەوە شوان نییە بەڵکە ئەوە شێرە و پێستی گۆڕیوە. با بزانین تیری ویی چ دەکا ؟!

لاس واتە کوردە تیری لە ماڵی کەوانی نا، کەوانی کێشا و تیری بەرەڵڵا کرد، تیری لە سێلێ مەفرەقێ دا و لەودیوبڕا هاتە دەرێ و هێندی چاڵێکی عەرزی دڕی. هەموو مات بوون، عاشقان چونکو قەراریان کردبوو کە بڕۆن بەهەڕەشە گوتیان دەڕۆین بەڵام دێینەوە و ماڵە مەلا نەبیش تاڵان دەکەین، خەزاڵیش دەبەین و کوردەش دەکوژین بەڵام ئێستا لەبەر شەرتەکەمان دەبێ بڕۆین و ئینجا ڕۆیشتن.

سێ ڕۆژ پاش وان لاسیش ئیجازەی لە خەزاڵێ وەرگرت، بڕێکی نان و پێخۆر هەڵگرت و خودا حافیزی لێکرد قەول و قەراریان دانا کە دەفلان وەختەی دا بێتەوە. ڕووی دەکوێستانێ کرد و لێیدا ڕۆیی، گەیشتە بن بەفران ئاویان لەبن دەهاتە خوارێ. گوتی وەڵاهی واچاکە لێرە چۆڕێک ئاوێ بخۆمەوە و پاروە نانێکی بخۆم. لەوێ دانیشت کە زەینی دایە گوڵ هاتبوونە دەرێ هەموو گوڵی یەک شەوە، دوو شەوەیان دەگەڵ نەبوو. دوو دەسکی گوڵ هەڵکەندن، هەر لە چۆغەکەی دوو هەودای لێ ڕاکێشان و پێی بەست، گوتی بریا کەسێک هەبوایە ئەو گوڵانەم بۆ خەزاڵی پێدا ناردبا. دەو دەمەی دا هەرا و هوریایەک پەیدابوو، گوتی ئەوە ڕەنگە لەشکری میر عەزیز و میر براغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و مەمەندی فەقێ وەیسی بن. ئەگەر ڕۆیوم بەبێ چەکیان زانیوم پێشیان گرتووم، بەڵام ئیشاڵڵا هەتا دەمگەنێ سەتی بەگۆچانان دەکوژم. دەو دەمەیدا کاروانێک وەدەرکەوت، کوڕە جحێلێک لە پێشدا دەڕۆیشت، ئەنگوچکی هاویشتبوونە پاشەسەری، ئەوەی دەیگوت نەی دەگوتەوە.





لاس لێی پرسی: ئەو کاروانە ئی کێیە؟ گوتی ئەو کاروانە، کاروانی خەزاڵێیە. جا گوتی مەقسوودی جحێلی لەکن جحێلی حاسڵ دەبێ ئەو دوو دەسکە گوڵەم بۆ بەرە کن خەزاڵێ، ئەگەر گوتی ئی کێن؟ بلێ ئی شوانە بچکەڵەی خۆتن.

کوڕە لێی ڕاست و چەپ بوو هەتا لێی بدا چوار گۆچانی لەنێو شانی دە لاسی دا دەتگوت لەجەواڵە کایەکی داوە ئەوجار گوتی: هەر دز و قون ڕووتێکی لەولایڕا دێ خۆ ئاشقە. لاس گوتی بڕۆ لەبەر دڵی خەزاڵێ چت پێ ناڵێم. پاشی ماوەیەکی دیکە دیتی ئەوە کابرایەکی پیر گایەکی بەبارەوە لێ دەقوڕێ کەوتبوو، ڕەفیق لەسەری ڕانەدەوەستا، ڕووی لە لاسی کرد و گوتی: ئەی جەوان ئەو گایەم دەگەڵ دەرێنەوە. لاس بار و گای بۆ لە قوڕێ دەرهێناوە و بردی بۆی لە ئیشکایی دانا ئەوجار گوتی ئەو دوو دەسکە گوڵەم بۆ بدە بەخەزاڵێ، ئەگەر گوتیشی ئی کێیە؟ بلێ ئی شوانە بچکەڵەی خۆتن. کابرا گوتی وەڵاهی چونکو ئەو چاکەت دەگەڵ کردم قەرار بێ بۆت بەرمەوە و بیدەمێ. جا ئەوجار هەر کام بەڕێگای خۆیاندا ڕۆیشتن. کابرای خاوەن بار و گا گوتی هەتا سیس نەبوون با بۆ خەزاڵێی بەرمەوە. خەزاڵیش کە لاس ڕۆیشتبوو زۆر قەڵس و تووڕە بوو داری بەبەردی دادەدا، کەس نەیدەوێرا تخوونی کەوێ. کابراش دەو دەمەیدا چوو گوتی یای خەزاڵ هانێ ئەو دەسکە گوڵەیان بۆ ناردووی. گوتی دا هەڵیگرن بەشەقان، کابرایان سەرێکی بەشەقان هەڵگرت کابرا گوتی ئەتۆ نە شەرەفت هەیە نە حەیا، هەر بەلانی کەم بپرسە ئی کێن. گوتی ئی کێن؟ کابرا گوتی ئی شوانە بچکەڵەی خۆتن لەڕێیە تووشی بووم. خەزاڵ گوتی: وەڵاهی لەبەر نەخۆشی بڕێک بێ هۆشم، دا بیهێننەوە خۆ بنەماڵی مەلا نەبی ئەو کابرایە دایناوە. بەڵێ گەنم و گاجووت و خەڵاتێکی زۆری دا بەکابرای.

لاس چۆوە وڵاتی باڵەکان، لەوێ دەستی بەحوکمات و ئاغایەتی خۆی کردەوە و وەک جاران چۆوە دەجلدی خۆی.

لەسەر و وەعدی گەڕانەوەی تێپەڕیبوو، خەزاڵ و ئەستێ مەلا داوودی دەچن بۆ سەر ئەو ڕێیەی کە عالەمی پێدا دێ کانییەکی لێ بوو خەزاڵ گوتی با بچین لەسەر ئەو کانیەی دانیشین دەشکم خەبەرێکی لاسمان وەگیر کەوێ چاوەڕێی کەسێکی بوون ئەگەر خەبەرێکیان بۆ وڵاتی باڵەکیان بۆ بەرێ کا لەمێژە لاس چۆتەوە و لە وەعدی تێپەڕیوە.

دەوەمەیدا قاسیدێک هات زۆر بەپەلە دەڕۆیی، خەزاڵ گوتی وەڵاهی ڕەنگە ئەو قاسیدە بێ با بەندێکی بانگ کەمێ بزانم لانادا خەبەرێکم بۆ وڵاتی باڵەکان بۆ بەرێ. بەڵێ جا بانگی کرد.

ئەوە دەڵێ: بەڵام کێ بوو لەبەر خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕێ مەلا نەبییە

دەڵێ سەرم لە ئێشە دڵم لە گرێیە

بانگ دەکا هۆی قاسیدە بابم قاسیدەکەی جووندییە

ئەتۆ لە کوێڕا دێی و بۆ کوێ دەچییە

ئەگەر مۆر و وەرقەی پادشات پێیە، دەچی بۆ وڵاتی سورچی و، زورار و، ڕەمک و ڕەبەشو، مام ساول و غەیلانییە

بەشقی خودای ڕێیەکی بۆ من بخەوە وڵاتی باڵەکان کن لاسە شۆڕی باڵەکییە،

بەسەری زمانی پێی بڵێ، بلێ دوێنێ ئەو دەمەی دەمدی لەشکری میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و مەمەندی فەقێ وەیسییە.

بەسەر ماڵە مەلا نەبیان دادا و ماڵە مەلا نەبیان تاڵان دەکرد خەزاڵیان بەیەخسیری دەبردییە

سواری یەسترێکی پشت برینداریان دەکردییە

خەزاڵیش بەپەنجەکەی دەقۆڵەکەی قۆڵەکەی جێ ماچی تۆی لە خوێنێدا شتڵ دەکردییە.

دەیگوت ئەگەر بمگاتێ چاکە و ئەگەر نەمگاتێ ئی من و وی لە دونیایە هیچ فایدەی نییە

ئەگەر ئەمن بەرن پەڕۆیەکی شینە لەسەر شانی وییە

ئەمما قاسید لابدە بتدەمێ چەنگێک زێڕ و زێو

ڕێگاکەت دووربەندەنە، نەوەکو بکێشی هەر برسیەتییە.

**

قاسید گوتی جا ئەمن چەند وەختە بێر و بەوێدا دەڕۆم ئەوەندەیان نەداومێ وەڵاهی با دوو ڕۆژ ڕێیە دووربکەومەوە و ئەو خەبەرەی بۆ دەگەیەنمێ. خەزاڵ ئەوەندەی بەدەستییەوە هات وێیدا و قاسید ڕۆیی. کە گەیشتە وڵاتی باڵەکان زەینی دایە ئەوە دەستە سوارێک کە سەد سوار دەبوون ڕاویان دابەشیوە، یەکێک سەر ڕاوە کڵاوی بەلاسەریەوە دوو تاجی دەدەستی دان، بازێکی لەسەر دەستی داناوە.. سواری ئەسپێکی بیوو ئەگەر گردەبۆری پێدەڵێن. گردەبۆریش لە دەستەوڵاغی شێخی عارەبان بوو کە زمانی بابی هێنابووی. لەوی وایە لە خۆی بەدەر کەس لەسەر دونیایە نییە.





قاسید گوتی: بێ و نەبێ ئەوە لاسە، ئەمما بانگ کەم تەسادوف نەوەک هەونەبێ. ناوەڵڵا با بەندێکی بڵێم ئەگەر لاس بێ حاڵی دەبێ و بۆ خۆی دێتە خوارێ، ئەگەر لاسیش نەبێ دەڵێ ئەوە کابرایەک بەڕێیەدا دەڕوا و قامان دەڵێ:

جا کابرا دەستی پێکرد، دەڵێ:

کێ بوو لەبەر قاسیدەکەی جووندییە، بانگ دەکا دەڵێ

هۆ هۆی سەرڕاوی سواران، ئەوە سواربووی لە ئەسپێکی مەحەندەکی کەحلانی لەوی دەبەحرییە

هەڵدەستێنی پۆڕی کەتێ دەگەڵ دەعبای دەکێویە

ئەمما ماڵ وێران لەتۆ وایە کەس لەتۆ بەدەر لە دونیایەدا نییە

ئەتۆ خەبەرت پێ نەگەیوە لەشکری میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و مەمەندی فەقێ وەیسی بەسەر ماڵە مەلانەبیان دادا و مەلا نەبیان تاڵان دەکرد و خەزاڵیان بەیەخسیری دەبردییە

خەزاڵیش بەپەنجەی دەقوڵەکە قوڵەکە جێ ماچی تۆی لە خوێنێدا شتڵ دەکردییە.

دەیگوت ئەگەر بمگاتێ چاکە و دەنا ئەگەر نەیە ئی من و ئی وی لە دونیایە هیچ فایدەی نییە.

ئەمما ئەگەر دەڵێی نێو و نیشانەی خەزاڵیت پێ نییە

گوێم بۆ ڕاگرە بزانە نێو و نیشانەی خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبی چییە.

ئەوە مەلا نەبی سێ کچی هەن یەکیان ڕابیە، یەکیان خوبیە، ئەوی لە هەموان بچکەلەتریان خەزاڵە، خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە.

هەرچی ڕابیە، نە بڵێندە نە نەوییە

هەرچی خوبیە، نە شڵەیە نە شەوییە

هەرچی خەزاڵە سەد ناوی خوای دەگەڵ بێ، تازە هاتۆتەوە لە گەرمێنێ، گەرمەسێری پەری ئەنگاوتوون دەڵەی خاسەسییە دەبەری دایە کراسێکی مەڵحەم کەتانی لەوی داراییە

لەپێی دابوو جووتێک کەوشی پانێ کورەکییە

بەسەری دادابوو چارۆکێکی کەتان قەت پەری مێشێ بەقەت وی تەنگ نییە

دەو دەمەیدا ئەگەر سواریان دەکرد بەیەخسیری بەرن هەڵی دەکرد بایە شەماڵی دەیدا لە دورِ و لەعل و یاقــووت و کــەڵەمــەرجــانم لەنێــو ســینگ و مــەمکی وی ڕادەپەڕین دوگمێک دەترازا خاڵێک لەنێو سینگ و مەمکان وەدەردەکەوتیە

بۆ درۆ و ڕاستی من و تۆ ئەو خاڵە دەتگوت مەجیدییە.

**

لاس گــوتی وەڵاهی ئەو کــابرایە هەر دەڵەی بەدایم دەگــەڵ خــەزاڵێ بــووە. ڕاوی بەتاڵ کرد و هاتە خوارێ، ئەوەندی بەدەستیەوە هات وە قاسیدی دا و، قاسید ڕۆیی، لاس کە گەیشتەوە ماڵێ پێنسەد سواری حازر کرد، دوو سەد و پەنجای ڕدێن سپی و دووسەد و پەنجای جحێڵ، بەشەو و ڕۆژ بەرێیەدا دەرِۆیشت تا گەیشــتە جێ هەواری کە خەزاڵێ لێ دیبوو بەڵام لە هەوارێ نەمابوون و جێ هەواریان گوێزتبۆوە و چووبوونەوە ئەودیوی. خەزاڵێش لیباسێکی کەسیفی دەبەرکردبوو بەتاقی تەنیا هاتبۆوە جێ هەواری پێشووی لەسەرکانی دانیشــتبوو. ئەو کانیــەی ئەگەر لەگەڵ لاسی لەوێ سوحبەت و قــومــاریان کردبوو. بەئارەزوو و بیرەوەری ئەودەمی هاتبۆوە وێ.

دەو دەمەیدا سواران بەسەر جێ هەواران وەرگەڕان، بەڵام کەسیــان لەوێ نەدیت. لاس گوتی کوڕینە ئەگەر ئەمن هاتمە ماڵە مەلا نەبی، لێرە بوون ئێستاش لێرە نەماون. ئەمما ئەوە ئافــرەتێک لەســەر ئەو کــانێــیــە، با بەندێکی بــانگ کــەمێ لەوی دەپرسم بزانم بۆ بەتەنێ لەسەر ئەو کانییەیە.

لاس خەزاڵی نەناسییەوە بەڵام خەزاڵ ئەوی ناسی، جا لاس بانگی کرد:

کێ بوو لەبەر لاسی باڵەکییە بانگ دەکا دەڵێ هۆ کیژی لەسەر کانییە

گەردەنبەندی قۆڵ بەبازنێ کەڵەگەتێ چاو بەنگییە

ئەتۆ سەر هەڵێنە و ئەمن قسێکی لەتۆ پرسیار دەکەم

ئەمما توخودا جوابم بدەوە بەئەسەحییە

دەمــانگی دیدا لێــرەبووم مــاڵە مــەلا نەبی لێــرەیان هەڵدابوو ئەلعــان بۆجی ســەر و سۆراغیان نییە

خەبەرێک بەمن گەیوە داخوا ئەو خەبەرە ڕاستە یان درۆیە؟

**

خــەزاڵ لەبەرەخــۆیەوە گــوتی: حــەقــیــەتی ئەگــەر نەمناسێ، چەند ڕۆژم شــوانی و





بەرخەوانی پێکرد و کۆڵەدارم پێ هێناوە ئەلعانیش سواری ئەسپێکی بووە کە گردەبۆری پێ دەڵێن سەد و سێزدە پارچەی ئەسلەحەی دەعوایەی لە خۆ داوە، پێنسەد سواری جەنگی دەگەڵە ئەمنیش دەو لیباسە کەسیفەیدا، ئەوە خۆی لێ گۆڕاوە. وا چاکە خۆمی پێ بناسێنم. جا خەزاڵ لە جوابیدا دەڵێ:

کێ بوو لەبەر خەزاڵێ دەڵێ سەرم لە ئێشە و دڵم لەتاوە

قایمەتی لەتاوە تاوە ئەرێ هۆ هۆی لاوە

سەرت هەڵێنە و چاوت بکەوە بلێ هەوە

ئەو خەزاڵی ئەتۆ لێی دەپرسی لەسەر ڕەنگی جاران نەماوە

فەقیر و مەزلوومە بێ چارەیە، خەراپی لێ قەوماوە

ئەمما بەسەری تۆ حەقتە نەیناسی سواری گردەبۆرێ بووی و سەد و سێزدە پارچەت ئەسلەحەی دەعوایە لەخۆ داوە

پێنسەد سواری جەنگیت لە پشتەوە ڕاوەستاوە

چونکە بابت باڵەکە و دایکت عارەبە دەو سەعاتەیدا بۆیە خۆت لێ گۆڕاوە.

**

جــا لاس گــوتی کــوڕینە ئەوە خــەزاڵە ئەمما عــەجــایب بۆچی بەتەنێ لێــرەیە، ڕەنگە بردبێــتیــان و هەڵاتبێــتەوە. لاس چووە خوارێ و لێی پرسی. خەزاڵ گوتی ئەو خەبەرەی کــە بۆم نــاردبووی بەدرۆم بۆ ناردی، ئەمما مــاڵمــان لەودیوییــە ئەورۆکــە زۆر وەڕەز بووم، هاتوومەوە جێ هەواری کۆن.

ئەڵعــانیش ســەعــاتێکی مــۆڵەتێ بگرە هەتاوەکــو دەچم لیبــاسێ دەبەر دەکــەم و خــۆ دەڕازێنمەوە، ئەگەر هاتی میوانی منی.

جــا هەســتــا چوو حــەوت دەســتی لیبــاس هێنا گــۆڕی، هەر جــارە یەکی دەبەر دەکرد و دایدەکەندەوە، بەرگــێکیــان بۆ تەشکیل دا و گــوتیــان بەو لیبــاســەیەوە زۆر جوانی، لە دەرکێ وەک تاوسی مــەست ڕاوەســتا. لەو دەمــەیدا لۆزەوی ســواران بەســەر عــێلی مــەلا نەبی دا هاتە خوارێ. ئەو دەمی ناسـیــان و گــوتیــان ئەوە لاسە شــۆڕی باڵەکیــانە، ئەوە هات. لاس لە گردەبۆری دابەزی خێوەتیــان بۆ هەڵدا. ڕســتەی خێــوەتیــان دەگــەڵ چادری تێک دەخست ئەو دووسەد و پەنجا ڕدێن سپیە دەمەجلیسی لاسیدا دانیشتن و دووسەد و پەنجا جحێڵــەکەش خزمــەتیــان دەکرد. کچەکــانی عــێلی خەزاڵێش تەواویان هاتبوونە

دیوی خەزاڵێ، کونە چیغ بە سەد زێڕان وەگیر نەدەکەوت تەماشای لاسیان دەکرد بزانن لاس چ لاسێکە. شەو بەسەردا هات، لەودیوبڕا خەزاڵ گوتی دەبێ میوان بزنێ بدا. لاس گوتی ئەمە پێنسەد و یەک سوارین. خەزاڵ گوتی ئەمن هەر ئاغای دەناسم، کارم بەسواران نییە.

لاس لە ڕدێن سپیانی پرسی: ئێوە پێتان چۆنە؟ گوتیان ئێمە پێمان باش نییە چونکە خۆ تۆ نە چاوەشی و، نە شایەری. لە جحێلانی پرسی گوتی: ئێوە پێتان چلۆنە؟ گوتیان ئەمە پێمان وایە ئەو شەونخوونی و ڕێ بڕینە لەبەر دڵی تۆ و خەزاڵێیە ئەگەر ئەتۆ بیلێیی، ئەمە چەپڵەی لێدەدەین و هەڵدەپەڕین، لەوەی خۆشتر هەرنابێ.

جا گوتی لەقەدەر ئەوەندەی جحێڵ وەرن دانیشن، ڕدێن سپی هەستن خزمەتێ بکەن، ڕدێن سپی هەستان و جحێڵ هاتن دانیشتن.

خەزاڵیش مەنزووری ئەوەبوو ئەگەر لاس شتێکی بڵێ چونکە ئەو کوردەی ئەگەر لەوێ بوو، هەموو بزانن ئەوە لاس بووە و، ئەو لاسە شۆڕەی ئەڵعان کوردەی جارانە، چونکە ئەگەر لاس بە بەرگی کوردەی ڕۆیشتەوە هەموو گوتیان خەزاڵ قەدەرێکی دەگەڵ کوردەی بوو کوردەش لێیدا و ڕۆیی. جا لاس لەودیوبڕا دەستی پێکرد:

بەڵان کێ بوو لەبەر لاسی باڵەکییە بانگ دەکاتە خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە دەڵێ: خەزاڵ ئەوێ ڕۆژێت لەبیرە ئەمن وەختێکی دەهاتم بەلیباسێکی کوردییە چەند ڕۆژانم بۆ تۆ دەکرد شوانی و بەرخەوانییە.

چەند ڕۆژێت هەر لەبیربێ ئەگەر گەڕەلاوژەت بەئاشقان دەکردییە

ئەمنیش بەسەری تۆ بەندی خۆم بۆ تۆ دەگوتییە

ئەمما خەزاڵ بەسەری تۆ عاشقان دەیاننارده کن مەلا نەبییە مەلا نەبی دەینارده کن تۆ ئجتۆش تەگبیرت بەمن دەکردییە

دەمگوت سێڵی مەفرەق بدروون دەلبادی ئاشقان تیرەندازی لێ بکەن هەرچی تیری لەو سێڵەی ڕۆیشتە دەرێ ئاشقی بەڕاستییە ئاشقان تیرەندازیان لێ کردییە ئەمن هێندی چاڵێکم عەرز دەدڕییە عاشقان بەهەڕەشە دەڕۆین دەیانگوت ئەمە دێینەوە تالان دەکەین ماڵە مەلا نەبی و خەزاڵێ دەبەین بەیەک جارییە ئەمما پاش سێ ڕۆژان ئەگەر ئەمن لەکنە تۆ بەڕێ دەبووم ڕووم دەکردە کوێستانی عەزیمەت و ناسازگار و بڵیند و نەوییە بەسەری تۆ گوڵم بەچاو دەنگاوتن، گوڵی یەک شەوە هیچ گوڵی دوو شەوەیان دەگەڵ نییە، خەزاڵ دوو دەسکم بۆ هەڵدەقەندی دەمگوت کەسێکم وەگیر کەوێ بنێرم بۆ





خەزاڵ بەدیارییە گرمێکم لەبن گوێی پەیدا دەبوو لە من وایە لەشکری میر عەزیز و میر براغ و ئەحمەدی ئاغای سورچییە ئەمما بەبێ ئەسلەحەیان زانیوم هەتا دەمگەنێ سەتی دەکوژم بەگۆچانییە.

دەو دەمەیدا کاروانێک وەدەرکەوت کوڕە جحێڵێک لە پێشدا دەهات ئەمما دەمگوت بابم ئەو کاروانە ئی کێیە

دەیگوت کاروانی خەزاڵییە، دێتەوە لە نوخشەی گەنمیە دەمگوت ئەو دوو دەسکە گوڵەم بۆ خەزاڵێ بۆ بەرە بەدیارییە

هیچ سێ و دووی لێ نەکردم چەند گۆچانێکی دەدام لەنێو شانییە

لەبەر ئەتۆ دڵم نەدەهات و هیچ قسەم پێ نەدەگوتییە

لەدوایە کابرایەکی پیرم بەچاو دەنگاوت گایەکی بەبارەوە لێ دەقوڕێ دەکەوتییە،

بار و گام بۆ دەردێنایەوە ئەمما ئەو دەسکە گوڵەم بەویدا بۆ ناردی داخوا پێت گەییون یان پێت نەدەگەیشتییە.

**

بەڵێ جا ئەگەر ئەوەی پێ دەگوت هەموو کەس بۆیان مەعلووم بوو ئەگەر ئەوە کوردەیە. جا بانگی کرد و گوتی شەوچەلەت بدەمێ یان جوابت بدەمەوە کە ئایا گوڵەکەم پێ گەییون یان پێ نەگەییون؟

لاس گوتی پێم خۆشە پێم بڵێی داخوا گوڵەکەت پێ گەییون یان نەخێر. ئەو کچانەی عێلێ کە لە دەوری خەزاڵێ بوون هاتبوون کە لاسی ببینن گوتیان جا ئەوە کەنگی گوڵە، ئەوە هەمووی گوڵی سەرڕێ و بەرڕێیانە، قولینچکە جەواڵی کاروانیان دەیانگرێ و تۆزی مەڕ و مێگەلانایان لەسەر دەکەون. نە گوڵی مێرگە چەکۆیە نە گوڵی مێرگە شەکۆیە، نە گوڵی مێرگە خڕکەڵەیە، نە گوڵی مێرگە چووکەلەیە، نە گوڵی چل پلەی عومانییە. ئەو گوڵانەیان هیچیان دەگەڵ نییە.

ئەوانیش مەنزووریان ئەوەبوو ئەگەر خەزاڵ ئەوەی پێ بڵێ، لاس پیاوێکی کەللەیە و، وە دوای گولان دەکەوێ و جا مامە ڕەشەکۆڵەی سەر تەریدەباشی کە لەو کوێستانانەیە لاسی دەکوژێ و لەکۆڵ ولاتی دەکاتەوە. یەک دەیگوت خەزاڵ بۆ ئامۆزای بێ، یەک دەیگوت بۆ پوورزای بێ. هەریەکەی تەگبیرێکیان لێ دەکرد. خەزاڵیش کە ئەوەی وە گوێ کەوت بانگی کرد و، وەڵامی داوە:

کێ بوو لەبەر خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە

بانگ دەکاتە لاسە شۆڕێ باڵەکییە

دەڵێ ئەو گوڵانەی بۆ منت دەناردن بەمامی ڕدێن سپییە

ئەو گـوڵانەم وەرگـرتوون و دەشـوێنێکی بلورم ناون ڕۆژێ سێ جـاران ئاویان دەدەم بەئارەقەی بەرگەردنێ بەخوناوەی سەری زولفان هەموو گەشن قەت گوڵێکی سیسیان دەگەڵ نییە

ئەوە گوڵی سەر ڕێ و بەر ڕێیانن و، لینچکە جەواڵی کاروانیان گرتییە

تۆزی ڕێگای مەڕ و مێگەلانیان لەسەر کەوتییە

نە گوڵی مێرگەچەکۆی، نە گوڵی مێرگە شەکۆی، نە گوڵی مێرگە خڕکەڵەی نەگوڵی مێـرگە چووکـەڵەی، نەگوڵی مـێـرگـە پانکەڵەی، نەگـوڵی چل پلەی عـومـانی نە ئەو گوڵانەیان هیچیان دەگەڵ نییە

ئەو گوڵانەم بەدیاری و سەوقات لەتۆ قەبووڵ نییە.

جا ئەگەر خەزاڵ وای گوت لاس قەڵس بوو گوتی جێم بۆ چاک کەن، جێیان بۆ چاک کرد لاس نوست هەتا سبەینێ ڕۆژ بۆوە ئەوجار بەو پێنسەد سوارەی کە دەگەڵی بوون گوتی: گیرمەبن بڕۆنەوە بۆ وڵاتی باڵەکان، قەراربێ هەر بەتەنێ بچم چل دەسکە گوڵان بۆ خەزاڵێ بێنم لەو کوێستانانە و هەمووشی بەسمێڵی مامەڕەشی دەبەستم کە لە پشتەوەڕا گرێ دەدرێنەوە. سوارەکانی بەڕێ کردنەوە و گوتی: ئەگەر هاتمەوە ئەمن ئاغای جاران و ئەنگۆش پیاوی جاران، ئەگەریش نەهاتمەوە خۆو دەزانن و کاری خۆتان.

ئەوان ڕۆیشتن. سبەینێ کە لاس هەستا گردەبۆریان بۆ حازر کرد، هەرچەندە خەزاڵ وەپێشی گەڕا و گوتی سەهویەک بوو کراوە، وەرە مەچۆ. لاس گوتی ئەتۆ ناچیزەی، دەبوو بەقسەی ئەوانەی وا لەکنتن وا بە من نەڵێی، ئەمن لەوانە نیم بترسم. بەڵێ لێی سواربوو ڕۆیی، ئەو سوارانەی دەگەڵی بوون گەڕانەوە ئەو خەبەرەیان بەخانزادەخانی هەریرێ دا کە زۆر بەهەویای لاسی بوو.

خانزادەخان خێوەتێکی پێدا هێنا و هات لەسەر ڕێی لاسی کە دێ و دەچێ بۆو کوێستانانەی ئەو گوڵانەی لێن. خێوەتی لێ هەڵدا.

لاسیش گوتی بچمە کن وەستا حەیدەری ناڵبەند گردەبۆرم بۆ ناڵ کا، بۆ کوێستانان لازم دەبێ. وەستا حەیدەر لە ڕۆستێ بوو. کە وەستا حەیدەر ناڵ و بزماری بۆ دەبڕی و





دەیدا بەدەستی لاسی، لاس بەدەستێکی دەینوشتاندەوە و دەیگوت ئەو ناڵە بۆ پێی گردەبۆری نابێ. زۆری عەزیەت دا لە پاشان هەرچی ئاسن و پۆڵا بوو بۆی هاویشتە سەری. لاس گوتی وەڵاهی بەپەلەم دەنا باش نییە ئەمما قەیدی نییە، سکەی ئەو دەمیش ئەگەر مەجیدی بوون بۆی دەرهێنا و بۆی هاویشت. وەستا حەیدەر بەقەستی توڕەی لەسەر لادەبرد هیچ خەتی و شتی نەدەما، دەیگوت ئەوە ناچێ، بەئەندازەی خۆی زەرەدی پێدا. لاس تووڕە بوو جا گوتی وەستا حەیدەر ئەوە ئەتۆ بەربەرەکانی دەگەڵ من دەکەی (وەستا حەیدەر لە تایفەی «کاوە»ی بوو) قەراری من و تۆ ئەوەبێ هەتا لەو سەفەرەی بێمەوە و ئینجا ڕۆیی.

وەستا حەیدەر سێ کوڕی هەبوو، شۆڕۆ، داوود و خاڵند، جا گوتی براله ئەمە کاسبیمان چەکوچ و دەزگایە، ئەوەش گۆڵ و دێڵی بەبایە ئەو وڵاتە بەکاری مە نایە لەو سەری بێتەوە تووشی هەرایەمان دەکا و دەگەڵ وی چمان پێ ناکرێ، واچاکە ماڵەخۆ وەگوێزین.

جا دەڵێن وەستا حەیدەر هاتە وڵاتی پشدەرێ. شۆران ئەگەر دێیەکی زۆرە، شۆڕۆ ئاوەدانی کردۆتەوە و بەنێوی وی کراوە. «داوودیە»ش ئەگەر ئاوەدان کراوەتەوە کوڕی نێونجی وەستا حەیدەری (داوود) ئاوەدانی کردۆتەوە. خاڵندیش وەکو بابی دەزگا و چەکوچی داناوە و کاسبی هەر ئاسینگەری بووە. ئەو وەستا خاڵەی کە ئەلعان لە وڵاتی سەری لە «خەلیفانە» پاراستانە، ئەو وەستا خاڵە، لەو خاڵندەی کەوتوونەوە بۆیەش پێیان دەڵێن وەستا خاڵە.

بەڵێ، جا لاس ڕۆیی گەیشتە دەشتێکی، خێوەتێکی لێ بوو. گوتی وەڵاهی واچاکە لەو خێوەتەی ئیستراحەتێکی بکەم. دەو دەمەیدا خانزادەخان هاتە دەرێ و گوتی واچاکە بڕێک زەمی خەزاڵێ بکەم، دەشکم لاس لێی پەشیمان ببێتەوە و لابدا. لاسیش ئەوە بەسواری ڕاوەستاوە.

خانزادەخان بانگ دەکا و دەڵێ:

سەرم لە ئێشە دڵم دەکا ژانێ

ئەمما قایمەتی لەژانە ژانە کوڕە ماڵ وێران ئەتۆ بۆچی ئەمنت بەتەنێ ناوە لەوان وڵاتانە بۆ کچەتیوێکی وەک خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیانە

ئەمما بەسەری تۆ ڕۆژێکی دەگەڵ ئەمن لە گازری بوو، دەبەری دابوو کراسێکی چڵکنی لەوی کەتانە.

ئەمما دەپێی دابوو جووتێک کەوشی پانەکەی دەوی هەمەدانە

بەسەری دادابوو چارۆکێکی چلّکنی لەوی قەرەچیانە ئەوە لەبەرچاوی من دەهات وەکو چ تاقە قەرەواشانە

ئەمنیش دەبەرم دابوو، ئەمما دە بەرۆکێمدا بلاوکردبوون دورٍ و لەعل و یاقووت و کەلّە مەرجانە

ئەمما دەبن ئەو کراسەی داپاوانم کردبوون جووتێک شەمامە ڕەنگین، بەسەری تۆ دەستی کەسیان وێ نەکەوتی بۆ تۆم کردبوونەوە پاوانە ئەوشۆ وەرە، لەنێو سینگ و مەمکی من ببەوە میوانە

هەتا کەلّەبابی سبحەینێ بەولاّتیدا دەخوێنێ

ئەمما لەنێو سینگ و مەمکی خۆم دەتکەمەوە تەرخانە

ئەمما دەڕۆی بۆوان بەندەنان نازانی مامەڕەشەکۆلّەی سەرتەریدە باشی ئەگەر دەتکا شەلاّلّ و بێ گیانە.

**

لاس کە گوێی لەو قسانەبوو ڕکێفێکی لەگردەبۆری دا و گوتی: وەلاّهی لام دەدا ئەمما چونکە زەمی خەزالّێت کرد و گوتت مامە ڕەشەکۆلّە دەتکوژێ قەراربێ لانەدەم.

خانزادەخان بەو جۆرە زەحمەتی بەخەسارچوو. لاس ڕۆیی ڕووی دەکوێستانان کرد، لەو دەمەیدا مامەڕەش کە دەگەلّ چل تەریدەکانی دانیشتبوو، دیتی سوارێک وەدەرکەوت. گوتی کوڕینە چەند ڕۆژە چمان وەگیرنەکەوتووە، ئەوە سوارێک هات. تەریدێکیان دەگەلّ بوو زۆر پیاو بوو، زۆر بەتاقەت بوو، پێی گوت بڕۆ خوارێ ئەو سوارەی بێنە هەتا ڕووتی کەین.

تەریدە ڕۆیشتە خوارێ بانگی لاسی کرد، گوتی هۆی سوارە، مەڕۆ. لاس گوتی: چت دەوێ بابم؟ گوتی وەرە سەرتەریدەباشی بانگت دەکا. گوتی بەپەلەم و دەڕۆم، چکاری بە منە. گوتی کورە وەرە سەگباب، گوتی جنێو مەدە ئەوە دێم، ڕکێفی لە گردەبۆری دا و هەلّی کردێ، ڕۆهاتە گوێی، کابرای بلّیندکرد و دایتەکاند گوێیەکی لەبن و ڕیشە هێنا دەرێ و بەقونەڕمبان پێی دادا، بەلاّم نەیکوشت. کابرا هەلاّت هاواری بۆ سەرتەریدەباشی برد. سەرتەریدەباشی ئەو جێیەی ئەگەر لێی دانیشتبوون دەعێی نەهێنابوو بۆ سوارێکی هەستی بچیتە خوارێ بەوی کوت و بەوی گوت بڕۆنە خوارێ بەدوو سێیەکان بیگرن و بیهێنن، گوتیان وەلاّهی ئەمە لەو پیاوەی بەتاقەتتر و





ڕەشیدترنین. ئەوەی ئەمە دیمان وای لەو کابرایەی کرد، وەلاّهی دەتاقەتی مەدان ییە مەگەر بۆ خۆت بچی. جا مامە ڕەشەکۆلّە ڕقی هەستا، هاتە خوارێ بەرەنگاری لاسی بوو، پشی پێ گرت جا بانگی کرد:

کێ بوو لە مامەڕەشەکۆلّەی سەرتەریدەباشییە

بانگ دەکاتە لاسە شۆڕی بالّەکییە

دەلّێ ئەرێ هۆی سوارەکەی جووندییە

بەشقی خودای ئەتۆ لە کوێرا دێیو بۆ کوێ دەچییە

بۆچی نێوبانگی مامەڕەشت نەبیستییە؟

کوڕە مالّ وێران ئەلحانەکە نێوی خۆت بەمن بلّێ با بە دەستە من نەکوژرێی هەر بەبێ نێوییە

ئەمما لاس بانگ دەکا دەلّێ مامەڕەش ئەتۆ ئەمن ناناسی ئەمن نێوم لاسە شۆڕی بالّەکییە

کوڕی ئەحمەد ئاغای شارەزوورییە

ئەمما پێمە شیرێکی لاهوری لەوی کۆسە میسرییە

بەدەستمەوە ڕمبێکی هەزدە قەفی لەوی سەر بە نسیرییە

پێمە کەوانێکی خاسەڕەنگ دەگەلّ سەت و بیست و چوار تیری سەر بەژەهری مارییە

کوڕە مالّ وێران ئەمن ئەگەر هاتووم ناوبانگی تۆم هەر بیستییە

بەسەری تۆ هاتووم چل دەسکە گولاّن لەو کوێستانانە بەرمەوە بۆ خەزالّێ بەسمێلّی تۆیان ببەستم، بۆیان بەرم بەدیارییە.

**

جا ئەگەر ئەوەی لە لاسی زانی، مامەڕەش هەلّی کردە لاسی. لاس خۆی لە ولاّغی فڕێدا و بەرۆکی مامەڕەشی گرت، بلّیندی کرد و لەعەرزی دا. خەریکی ئەوەی بوو سەری ببڕێ، مامەڕەش پاڕاوە، گوتی لاوە ئەمن مەکوژە، چەند وەختە ئەمن پیاوێک بووم هیچ کەس نەبوو دەستم لەبەربکاتەوە ئێستاش ئەتۆ پشتی منت لەعەرزی داوە ئەگەر ئەتۆ لاس، ئەو مەردایەتییەت هەبێ و نەمکوژی ئەمن بەخۆم و چل تەریدەی دەبمە خزمەتکاری تۆ و، نالّی ولاّغی دەگوێی من بکە.

لاس گوتی: وەلاّهی نالّی ولاّغیت دەگوێی ناکەم، غەیاتی چونکو قەرارم داوە چل

موروان لە سمێڵی تۆ دەکێشم و چل دەسکە گوڵانی پێ دەبەستم. جا لاس گیانی مامەڕەشە کۆڵەی بەخشی و ئازادی کرد. مامەڕەش بانگی تەریدانی کرد، تەریدە هاتن کە چاویان بەو حاڵەی کەوت گوتیان: عەجایب بۆچی تا ئێستا شەڕیان بوو کەچی ئێستا ئاشت بوونەوە! مامەڕەش تەریدەکانی ناردنە کوێستانێ کە هەر یەکەی دەسکە گوڵێکی بێنێ. چل دەسکە گوڵیان هێنا، لاس چل مووی لە سمێڵی مامەڕەشی کێشا و، ئەو گوڵانەی پێ بەست. مامەڕەشی بەچل تەریدانەوە دەگەڵ خۆی هێنا و هاتەوە کن خەزاڵێ.

لەپاش ئەو ڕووداوە لاس نێوبانگی دەرکرد و لە وڵاتدا کەس نەیدەوێرا تەنانەت لە ماڵە خۆی بەخەراپە باسی لاس بکا و، لاس لەوێ ماوە.

**

بەڵام با ئێستا بێینەوە سەر باسی میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و مەمەندی فەقێ وەیسی کە ئاشقی قەدیمی خەزاڵێ بوون و لەبەرئەوەی کەشەرتەکەیان دۆڕاندبوو کە نەیانتوانیبوو تیری لە سێڵی مەفرەق دەرکەن لەوێ ڕۆیبوون.

ئەو چەند کەسە پێکەوە لەشکرێکیان سازکرد و هاتن، گوتیان ئەمە قەرارمان کردبوو بچین ماڵە مەلا نەبی تاڵان بکەین و کوردەی بکوژین. جا هاتن دوور و نیزیکی عێلێ بوون، بەڵام خەبەریان پێدان کە لاسە شۆڕی باڵەکی لەوێیە و مامەڕەشی بەخۆی و چل تەریدانەوە گرتووە و هێناوێتی، ئەلحانیش ئەوە لەکن خەزاڵێیە. جا گوتیان ئەگەر وابێ ناچینە نێو عێلی، مەڕ و گاڕان و شتی وایان کە لە دەرێیە دەپێچینەوەو دەیانبەین. بەو جۆرە هەرچی پەیوەندی بەماڵە خەزاڵێوە هەبوو و لەبەندەنی بوو پێچایانەوە و بردیان.

هاوار دەعێلێ کەوت، دەو دەمەیدا، لاس سەری وەسەر ڕانی خەزاڵێ کردبوو و، خەوی لێ کەوتبوو.

خەزاڵ گوتی کەس دەنگی نەکا، هەرایە مەکەن با لاس وەخەبەرنەیەت. لەشکری فەقێ برایمی کوڕی مەلا نەبی کە برای خەزاڵێ بوو دەگەڵ خدری مەلا داودی ڕۆیشتن. وە دوای تاڵان و هاوارێ کەوتن. مامەڕەش بەخۆی و، چل تەریدانەوە وەدوایان کەوت. لاسیش وەخەبەر هات گوتی: ئەو هەرا و هۆریایە چییە؟

گوتیان حاڵ و نەقڵ ئاوایە. لاس بەخەزاڵی گوت دەبوو ئەمن هەستێنی، ئەتۆ مەنزوورت ئەوەیە حەیای من بچێ. جا چۆن شتی وا دەبێ، ئەمن لێرە بم بەڵام دوژمن بێت ماڵ و ڕەوەی بەرێ؟ ئەوە بۆ من زۆر عەیبە. فەرمانی دا گردەبۆریان بۆ هێنا دەرێ





و سواری بوو، ڕۆیی.

ئەوانی دیکە بەڕاستە ڕێیەدا وە دوای تاڵانێ کەوتبوون، بەڵام ئەو بەلایەکی دیکەدا ڕۆیشت و، بەتەنێ پشتی گرتن، جا بانگی کردنێ و گوتی:

کێ بوو لەبەر لاسی باڵەکییە بانگی دەکا و دەڵێ: هۆی میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و، مەمەندی فەقێ وەیسییە

کوڕە ماڵ وێران ئەوە پێو عەیب نەبو هەڵدەگرن تاڵانی ئەوان مسکێن و مەزلوومان، ئەگەر هیچ خەتا و تاوانیان نییە.

دەبوو بێن نێو عێلێ مەلا نەبی و تاڵان بکەن مەلا نەبی و ئەمما خەزاڵێش بەرن بەیەکجارییە

ئەو تاڵانەی بەجێ بێڵن ئەگەر ئی مسکێن و فەقیرانە هیچ خەتایان بۆ نییە

ئەمما کێ بوو لەبەر مەمەندی فەقێ وەیسییە

بانگ دەکاتە لاسە شۆڕی باڵەکییە

ئەو سەفەرەی هەڵدەگرم تاڵان و ماڵ و مەڕی مسکێن و بێ چارانە ئەگەر هیچ خەتایان نییە

ئەوجار بەسەری تۆ دێمەوە تاڵان دەکەم، ماڵە مەلا نەبی و خەزاڵێش دەبەم بەیەکجارییە

ئەمما لە کوشتنی تۆ خۆش بووم ئەگەر چوومەوە وڵاتی سورچی و زرار و ڕەمک و ڕەبەن و، مام ساول و غەیلانییە

بە من دەڵێن ئەتۆ عەیبت نەدەکرد لەسەر دوو چاوی خەزاڵی دەتکوشت هەتیوێکی خوێڕیلکەی باڵەکییە

ئەمما لاس ئەوەی دەبیست لە مەمەندی فەقێ وەیسییە

دەستی دەدا ڕمبێکی هەژدە قەفی سەر بە نسیرییە ڕمبێکی دەدا لە مەمەندی فەقێ وەیسی هەڵیدەگرت لەنێو خوانی زینی، شیرێکی دەدا لەمیر عەزیزی، میر بداغ هەڵدەهات دەیگوت چ کارم بەو هەراو هۆریایە نییە

ئەمما بەسەری تۆ جارێکی بای دەداوە، ڕووی دەکردە ئەحمەد ئاغای سورچی دەکوشتییە.

ئەمما لاس دەڵێ سەرم لە ئێشە، دڵم لەتاوە، قایمەتی لەتاوە تاوە

بەنێو لەشکری میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی دادەهات هێندێک دەیانگوت ئەجەلی مەرگییە و هێندێک دەیانگوت ئەوە لێشاوە

لاس دەستی شل دەبوو لە لێدانێ و ئەگەر ئاوڕی دەداوە، مامەڕەشی سەرتەریدە باشی لەپشتەوە ڕاوەستاوە

ئەمما مامەڕەش دەڵێ ئاغا سەرم لە ئێشە دڵم لەغارە قایمەتی غارە، غارە

بەدەستمەوە شیرێکی لاهوری لەوی جەوهەردارە

پێمە ڕمبێکی هەژدە قەفی لەوی بیست و چوارە

ئەمما بەسەری تۆ پێمە کەوانێکی خاسەڕەنگ دەگەڵ سەد و بیست و چوار تیری سەر بەژەهری مارە

ئەمما ئەتۆ لەسەر ڕکێفان ڕابوەستە بڕوانە مامەڕەشی هەتا نوێژی نیوەڕۆیە، بۆ من حەواڵە بکە لەشکری میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و هەزار و پێنسەد سوار، هەر بە ئەژمارە.

**

لەو شەڕەدا ئەوی کوژرا، کوژرا، ئەوی هەڵات و بەفێڵێکی خۆی دەربازکرد ئەوە نەجاتی بوو. لاس و مامەڕەش تاڵان و مەڕ و ماڵیان گێڕاوە، تازە لەشکری فەقێ برایم و خدرۆکەی وەدەر دەکەوتن ئەوانیش ئەگەر گەیشتنێ دەقاش و قروش و تاڵانی وان وەربوون. هەتاوەکونێ پاییز بەسەر داهات و ماڵ چوونەوە دەخانوان، لاس لەکن خەزاڵێ دانیشت. پاییز کە هات لاس ئیجازەی لە خەزاڵێ خواست و گوتی: ئەوە زستانە، چ لە گۆڕێ نەماوە ئەمن ئەوە دەچمەوە وڵاتی باڵەکیان هەتا بەهارێ و، ئەو کاتی دێمەوە. قەراری من و تۆش ئەوەبێ هەتا خشە لە وڵاتی بێ و هەتا یەکێک بمێنێ و بڵێ ئەمن تەعەروز بەعێلی خەزاڵێ دەکەم، ئەمن حازرم. بەو جۆرەی لاس هاتەوە وڵاتی باڵەکان هەتا بەهارێ. بەهارێ عێلی مەلا نەبی ئەوەل هەوار ئەگەر لێیان نا، چوون لە دەڕەیەکی هەڵیاندا.

ئاڵی مەمەند کوڕی مەمەندی فەقێ وەیسی بوو لە خوێندنی تەواو ببوو، کوڕێکی بەتاقەت و ساحەب عەشیرەت ئەمما زۆردار و زاڵم بوو. کە بابی کوژرا، هاتەوە هەتا بەهارێ خەریکی ئامادەکردنی لەشکرێکی بوو، لەشکرەکەی ساز کرد و گوتی قەراربێ بچم تۆڵەی بابی خۆم بکەمەوە، ئەوان ماڵیان بارکرد عێلی مەلا نەبی لە جێیەکیان تاوڵ هەڵدابوو، لەشکری ئاڵی مەمەندی شەوێ هاتن دەورەی عێلی مەلانەبیان دا و





نەیانهێشت نەکەس بچێتە دەرێ، نەکەس بچتە ژوورێ.

خەبەریان بۆ مەلا نەبی برد گوتیان لەشکرێک دەورەی عێلێی داوە. گوتی بپرسن بزانم کێیە و چی دەوێ؟ گوتیان ئاڵی مەمەندی هاتووە بۆ خوێنی بابی.

مەلا نەبی گوتی ئەو سەگبابە سەری منی بەهەنگوین کرد، مێشی تێ بەردان و ڕۆیی. بۆ خۆی ئەو هەرا و هۆریایەی سازکرد و چۆوە وڵاتی باڵەکان، ئەلحانیش وەڵاهی ئەمە پیاوی شەڕی نین و شەڕمان دەگەڵ وی پێ ناکرێ، خوێنی بابی چی دەوێ هەتا بیدەمێ. گوتی لە خوێنی بابم، خەزاڵم دەوێ. خەزاڵ کە مارەکراوی خدری مەلا داودی بوو بەزۆر و زۆرداری پێیان تەڵاق دا و لە ئاڵو مەمەندیان مارەکرد. ئاڵو مەمەند گوتی: هەتا ئێستا هەر، هەرا و ناخۆشی و شەڕ بووە غەیاتی ئەوجار هەر لێرە خەزاڵێ دەگوێزمەوە.

خێوەت و بارەگای خۆی لەوێ لە عەرزی دا و لە عەشیرەت و عالەمێی گێڕاوە، چاوەشان دەستیان بەبەزم و ڕەزمێ کرد ئەوە خەزاڵیش ڕووی خۆی دەڕنێتەوە و خەریکی ئەوەیە کەسێکی پەیدا بکا ئەگەر بینێرێ لە دوای لاسی. کابرایەکی پەیدا کرد، کاغەزێکی بۆ نووسی کە ئەگەر دەگاتێ چاکە دەنا تازە خەزاڵی لە قیس چوو.

لاسیش لە وڵاتی باڵەکان شەوێ خەونێکی دیت، خەونەکەی بۆ مامەڕەشی گێڕاوە، گوتی: مامەڕەش ئەوشۆ لە خەونمدا سێڵاوێک هات لە مەڕی مەلانەبی دا. دەنێو ئەو مەڕەیدا شەکێکی هەڵگرت و ئەوی دیکە هەمووی بەسەلامەتی دەرچوو.

لاس لەبەر ئەو خەونەی دڵی ئۆقرە نەدەگرت، گوتی هەستن سواربن بابڕۆین لەشکری دەگەڵ خۆی نەهێنا، هەر مامەڕەشی سەرتەریدەباشی بەخۆی و چل تەریدانەوەی دەگەڵ خۆی هێنا و هات. لەنیوەی ڕێیەدا گەیشتە ئەو قاسیدەی کە کاغەزی پێ بوو، ئەویش خەبەرەکەی پێدا. ئینجا لاس لە خەونەکەی حاڵی بوو. زانی خەریکە خەزاڵی لەدەست بچێ هەر بۆیەش بەشەو و ڕۆژ بەبێ ئەوەی وچانێک بدات، بەڕێگایەدا دەڕۆیشت تا گەیشتێ. ئەگەر گەیشتێ دیتی ئەوە داوەت دەگەڕێ و کەس ئاگای لە کەس نییە، هەر شاباشێکی دەدرێ بەنێوی ئاڵی مەمەندی دەدرێ. لاسیش لە پشت داوەتێ دابەزی، گردەبۆریان بۆ گرت. گوتی ئەوە ئەمن لە دەستی سەرچۆپیەوە، دەچمە دەداوەتێ و هەڵدەپەڕم.

مامەڕەشیش هات لەنێوەڕاستی داوەتێ ڕمبێ چەقاند و لەوێ ڕاوەستا تەریدەکانیش لە پشت داوەتێ ڕاوەستان.

ئەو خەبەرە بەخەزاڵێ گەیشت، گوتیان مزگێنیمان بدەیە ئەوە لاس هات. یەکێکی نارد کە زۆر چاک لاسی بناسێ، کابرا هاتەوە و گوتی: بەڵێ هەوە، لاس خۆیەتی و ئەوە دەداوەتێدایە.

خەزاڵێش خۆی ڕازاندەوە، لیباسی جوانی دەبەرکرد و هات دەستی داوەتێی گرت. ئاڵی مەمەندیش دەگەڵ پیاوی دەگەورە گەورە لە مەجلیسێ دانیشتبوو.

کە خەزاڵ چۆ داوەتێ، دەستی لاسی گرت، کابرای چاوەشیش داوای شاباشی لێکرد (جاران و ئێستاش لەوێ بەو جۆرەیە، کابرا پوڵی وەردەگرێ و پێ هەڵگوتن نییە هەر کەسە بۆ خۆی پوڵی وێ دەدا و کابرا بانگ دەکا و دەڵێ: شاباش بەنێوی فلان کەسی، هەر شاباشێکیش دەکرا دەیانگوت بەنێوی ئاڵو مەمەندی) لاس مستێکی باجاغڵی دەرهێنا دای بەکابرای چاوەش و گوتی هاوار بکە شاباش بەنێوی لاسە شۆڕێ باڵەکی، چونکە ئەو داوەتە بۆ منە و بۆ من دەبێ. کابرای چاوەشیش یەک بەخۆی هاواری کرد و گوتی: شاباش بەنێوی لاسە شۆڕی باڵەکی. یەک لە پیاوەکانی ئاڵی مەمەندی شەقێکی تێهەڵدا و گوتی: سەگباب بەگۆڕی بابی خۆت و لاسە شۆڕی. کوڕە گوتی سەگباب بۆ خۆتی، ئەمن تاوانم لەسەر نییە ئەمن چاوەشم چۆنم پێ بلێن وای دەڵێم و هەرچی وێمدەن ئەمن بەنێوی ئەو کەسە بانگ دەکەم چکارم بەوەی داوە، ئەوەکێیە و کێ نییە.

تەماشایان کرد، کوڕە گەزی چی و، جاوی چی ئەوە خەزاڵ دەدەستی لاسی دایە و مامەڕەشیش ڕمبی چەقاندووە و لەنێوەڕاستی داوەتێیە. ئەو خەبەرەیان بەئاڵی مەمەندی گەیاند. ئاڵی مەمەندیش زرێ و کڵاوی زرێی تەڵەب کردن و ئەسپیان بۆ هێنا مەیدانێ. دەنگی لەشکری دا، لاسیش بەخەزاڵێی گوت ئەتۆ دەستی داوەتێ بەرمەدە ئەمن ئەوە دەچمە دەرێ و ئەتۆ مەیە.

لاس چۆ دەرێ و لێی سواری گردەبۆری بوو لەگەڵ ئاڵی مەمەندی بەرەنگاری یەک بوون، ئەو سوار و ئەویش سوار. هەردووکیان ئەسلەحەی دەعوایان بەدەستەوەیە و داوەتیش ئەوە دەگەڕێ و لەشکریش حازرە. جا لاس بانگی ئاڵی مەمەندی دەکا و دەڵێ:

ئەمما لاس دەڵێ ئاڵی مەمەندی سەرم دێشێ

ئەمما دڵم دەکا ژانێ سەرم دێشی و دڵم دەکا ژانێ

کوڕە ماڵ وێران ئەتۆ زرێ و کڵاوی زرێیان لەخۆ فڕێ بدە دوو بەدوو ئەمما دەستی





چەپە دەدەین بەدەستی یەکتری و ڕادەوەستین لە نێوگەڕی داوەتێ لە گۆشەی مەیدانێ

بەخەنجەری نێرۆیی لێک دەدەین هەرچی مرد بابمرێ هەرچی ما با خەزاڵ بەدووچاوی جوان لەوی بڕوانێ

ئەمما لاس دەڵێ: ئاڵی مەمەند سەرم دێشێ و دڵم دەناڵێ

ئەمما مەرد ئەو مەردەیە لە گۆشەی مەیدانێ زرێو کڵاو زرێیان لە خۆی فڕێ بدا قۆڵی شەڕی هەڵماڵێ

ئەمن و تۆ لە گۆشەی مەیدانێ لەنێو گەڕی داوەتێ، دەستی چەپ دەدەین بەیەکتری بەدەستی ڕاستە لێک دەدەین بەخەنجەری نێرۆیی لەبەر چاوی خەزاڵێ.

ئەمما لاس بانگ دەکا: ئاڵومەمەند سەرم لە ئێشە دڵم لە ژانە

قایمەتی لەژانە ژانە بەسەری تۆ ئەوەندە لەشکرەی پێتە نابێ بەشی مامەڕەشی سەرتەریدەباشی و بەشی چل تەریدانە

ئەگەر لە گۆشەی مەیدانێ ئەمن و تۆ فڕێدەین کڵاو و زرێیان دەست دەدەینە خەنجەرێ دەسک نێرۆیی عەسڵەدەبانە

لە نێوگەڕی داوەتێ دەستی چەپە دەدەین بەیەکتری و بەدەستی ڕاستە لێک دەدەین، خەزاڵی لەمە بڕوانێ بەچاوی دەجوانە

ئاڵو مەمەندی زۆری لە خۆی ڕادەدی، چاویشی بەخەزاڵێ کەوتبوو وەک شەڕابی خواردبێتەوە مەست ببوو. جا ئەگەر لاس ئەوەی پێ گوت زرێ و کڵاو زرێی لەخۆ فڕێدا و لە وڵاغی دابەزی.

لاسیش خۆی فڕێدا و دەستی چەپەیان دا بەیەکتری، هەرچی ئاڵو مەمەند بوو چونکە نەیکردبوو، نەیدەزانی لە ڕاستەیڕا خەنجەرێکی داهێنایە لاسی، لاسیش لە چەپەیڕا خەنجەرێکی ئەنگاوتێ و جەرگ و ڕیخۆڵەی بەمەیدانێ وەرکرد و مەیتی ئاڵو مەمەندی لەوێ کەوت. لاسیش برینی سارد ببوونەوە خەریک بوو بکەوێ، مامەڕەش نەیهێشت بکەوێ هەڵیگرت و بردی بۆ خێوەتی خەزاڵێ. چاوێکی لە تەریدان هەڵتەکاند تەریدان دەستیان بەشەڕێ کرد و دەنێو لەشکری ئاڵو مەمەندی کەوتن ئەوانیش چونکە گەورەیان نەمابوو شکستیان کەوتێ، هەمووشیان بێگارچی و ڕەعیەت و سوار و مسکین سوار بوون کە هێنابوونی هەر کەسەی بەلایەکیدا خۆی دەرباز کرد.

لاس بەبرینداری لە ماڵە خەزاڵێ کەوتبوو، خەزاڵێش هەموو ڕۆژێ دەینارد حەکیمی

دەهێنا هەتا ئێوارێ پێی دەرمان دەکرد و ئێوارانیش حەق و حیسابی خۆی دەدایە و بەرێی دەکرد. ئەگەر گوتبایان لە فلاّنە جێیەی کەسێک هەیە سەری لە برینان دەردەچێ و دەستی حەکیمی هەیە، بەدوایاندا دەنارد و دەیان هێنا سەر لاسی.

دوای چل شەوی برینەکانی لاسی سارێژ بوونەوە، گوتی گردەبۆرم بۆ بێنن بزانم سواریم پێ دەکرێ یان نا ؟

گردەبۆریان بۆ هێنا، لەمەیدانێ برێکی ڕمبازێن کرد ئەوجار ڕاست ڕۆیی بۆ پێش مەلانەبی جا گوتی کەیفت لێیە شەڕم دەگەڵ بکە، دەنا خەزاڵم لێ مارە بکە.

بەو جۆرە خەزاڵیان لە لاسی مارە کرد، ئەستێ مەلا داودیشیان بەفەقێ برایی تەلاّقدا و ئەویشیان لە مامەڕەشی مارەکرد. پاشان ئەگەر مامەڕەش لەوێ دەماوە لاس بەخۆی و خەزاڵێ دەچوونەوە ولاّتی باڵەکان، ئەگەریش مامەڕەش دەچۆوە وێ لاس و خەزاڵ دەهاتنەوە نێو عێلی مەلا نەبی. بەو جۆرە ئاگایان لێ دەبوون و بەجێیان نەدەهێشتن دەیانگوت نەوەک دوژمنێک زەفەریان پێ بەری، چونکە بۆ ئەوان عەیب بوو. لاس حەوت ساڵان بەو قەرارەی بەپیاوانە و مەردانە ڕایبوارد. ڕۆژێکی کە سەری لەسەر ڕانی خەزاڵێ بوو «کەونە چەتە»ی قەدیم جا ئەگەر لە تایفەی میر عەزیز و میر بداغ و، ئەوان بوون یان نا، هاتن ڕەوەی مەلا نەبیان هەڵگرت و گاڕانیان برد. پیرێژنان دەستیان بەقیژە قیژێ کرد، ئەو گوتی مانگام نەماوە، ئەو گوتی زاری منداڵانم ویشک بوو، خەزاڵ دەیگوت دەنگێ مەکەن لەباتی مانگایەکی دوو مانگاتان دەدەمێ با لاس هەڵنەستێ و هیچ قەزیە ڕوو نەدەن.

لاس وەخەبەر هات، گوتی ئەو هەرایە چییە؟ کە پێیان گوت مستێکی لە دەمی خەزاڵێ دا و زاری پڕ کرد لە خوێن. گوتی ئەوە تۆ تەماتە وەک جارێ دی حەیام بەری، چۆن ئەمن هەڵناستێنی؟

خەزاڵیش ئەوەندەی بەزاریدا هات گوتی: بڕۆ یاخودا بەتیری چڵکنیەوەبی. هەر چۆنێکی بێ لاس خۆی گەیاندێ و تالاّن و ماڵەکەی گێڕاوە، کابرایەکی بۆرەکە لەبن گوێنیەکی تیرێکی هاویشتە لاسی و، وەڕانی کەوت. لاس تیرەکەی دەرنەهێناوە گوتی چونکە خەزاڵ بۆ خۆی دوعای لێکردووم. تیرەکە بەژەهرێ ئاودرابوو، غاری دایە کابرای و ڕمبێکی تێ کوتا و، بەسەری ڕمبێوەی کرد. هەتا گەیشتەوە ئەو ژەهرەی دەبەدەنی گەڕا و برینەکەی لێ بوو بەتیراوە.

لاس حەوت ساڵانیش بەتیراوەداری ماوە و دوو کوڕی بوون لە خەزاڵێ کە ئەوانیش





ئەحمەد ئاغا و خدر ئاغای ولاّتی باڵەکان بوون.

شێخ محەمەد ئاغای وەلاّشێ، عەلی ئاغای ڕایەتێ و عەلی ئاغای حاجی ڕسو ئاغای ناوپردان لە لاسی کەوتوونەتە.

ئێنێ و خۆشکان و بن دایزان و مەرانیش لە مامەڕەشی کەوتوونەوە. حەساری مامەڕەشی کە شوێنی ڕاولێکردنی مامەڕەشی بووە بەکێوی گەلاّڵەوەیە ئێستاش هەر پێی دەگوترێ حەساری مامەڕەشی.

خەزاڵ چواردە ساڵان لەکن لاسی بوو، لاس مرد و پاش لاسیش خەزاڵ نۆ ساڵان ژیا و حوکماتی ولاّتی باڵەکانی کرد هەتا کوڕی گەیشتوونێ ئەوجار مردووە.

مامەڕەشیش هەر ئەو سەروبەندی مردووە و ئێستاش لە تایفەی وی خەڵکێک هەر ماون.

***

## بەیتی برایم و میران

وێژەر: عەلی کردار
ئاوایی باخجەی مەنگوڕ

میر حەج و میر شێخ و میران برابوون و ماڵیان لە کۆیە بوو. ڕەئیس عەشایر بوون مودەت عەیامێک بوو پێکەوە دەژیان و لە ملّک و ماڵەکەش شەریک بوون. خوشکێکیشیان هەبوو بەنێوی خاتوون.

میر حەج و میر شێخ ژنیان هێنابوو. خاتوونیش بن پشکی میرانی بوو کە یان میران ژنێ بێنێ و، ئەو مێردی بکا یان بە ژنی بدا.

پاش چەند ساڵێک خودا بارێکی لە شانی میرانی نا و میران گول بوو. ماڵێکی سەر ئاواڵە و دەوڵەمەندبوون و میوانیان زۆر دەهات، پێیان گوتن: بابە میران گول بووە و پیاو پارێزی لێدەکا. ئێوە دەوڵەمەندن و ماڵی دونیایە و، زۆرە. یان یەکێکی بۆ بگرن خزمەتی بکا، یان دەری بکەن با بڕوا، ئاخر خۆ ناکرێ ئەو لە مەجلیسێ دانیشێ و دەگەڵ ئێمە نانی بخوا.

ڕۆژێکی میر حەج بەمیرانی گوت: میران، برالە ئەتۆ گول بووی و خەڵک پارێزت لێدەکا، ئێستاش ئەوە کاری خوایە و دەبێ ڕازی بین پێت خۆشە ئەوە لە پەنا ماڵە خۆمان خانووت دەدەینێ و خزمەتکاریشت بۆ دەگرین هەتا دەمری خزمەتت بکا. ئەگەر

ئاوا ڕازی، ئەوە باشە ئەگەر نا دەبی بڕۆی. میرانیش کە جوان و جحێڵ بوو زگی بەخۆی سووتا، هەستا ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیشت.

برایمی مەلا زێندینی کە زۆری میران خۆش دەویست و نۆکەری بوو، وە دوای کەوت. میر حەج و میر شێخ پێیان گوت: برایم تازە میران بۆ ڕەفیقی تۆ نابێ، ئەو تازە گول بووە و، بۆ خۆی دەچێ سواڵ و سەدەقەی خۆی دەکا هەتا خودا دەیکوژێ. ئەتۆ مەچوو. برایم گوتی: خودا، یەکە و نابێ بە دوو، لێم دوورەوەکەن حاڵم نابێ و من بەبێ وی ژیانم ناوێ وەڵاهی وەدوای دەکەوم یان دەقوڵکێم دەخا، یان دەقوڵکێی دەخەم تازە بەجێ ناهێڵم. هەرچەند پێیان گوت برایم نەگەڕاوە. بەو جۆرەی چەند ساڵێکی سواڵی دەگەڵ کرد، دەچوو لەبەر هەیوانی مزگەوتێ و لە سێبەران، لە چارداغان لە مزڵێکی، نیانی دایدەنا و سواڵی نانی بۆ دەکرد.

ڕۆژێکی بێری دەنێو مەڕی دابوون، میران گوتی برایم برسیمە و ئیشتیام لە شیرییە، دەبێ بچی بۆم بێنی. ئەوان ئەسپابی خۆیان پێ بوو جا گڵێنە بێ، جام و قاپ بێ هەرچیەکی بێ.

برایم قاپێکی دەست دایە و چووە کن بێریەکان، لەو مەنتەقەی خۆشیان وا مەنشوور ببوون هەموو کەس دەیناسین. بێریەکان گوتیان ئەوە دەزانین بۆ میرانە گولەتە هەربۆیەش ئێمەش ستڵ و قاپی خۆمانت وێ نادەین، گوتی قاپم هێناوە ئەگەر بۆمان تێدەکەن. جا هەر بێریەی لە ڕاستە خۆی ئیستکانێک یان پیاڵێکی بۆ تێکرد.

کاتێک برایم شیرەکەی هێناوە دیتی میران خەوی لێ کەوتووە. قاپە شیرەکەی لەبن کەڵەک و پنچکە شیلانێکی دانا و گوتی: وەڵاهی میران خەوی لێ کەوتووە، هەڵی ناستێنم دوایە نانەکەمان دەخۆین و دەچین بۆ دێیەکی دیکە.

برایم لە تەنیشت میرانی ڕاکێشا و خەوی لێ کەوت، وەختێکی کە هەستا دیتی ئەوە مارێک لە کەڵەکەکەی هاتۆتە دەرێ شیرەکەی خواردۆتەوە و چۆتەوە دەکەڵەکێ. جا گوتی: خۆ ئەوە بێرییەکانیش لێرە نەماون خۆ ئەگەر میران وەخەبەربێ دەگری و خۆی دەپچڕێتەوە، دەڵێ ئەتۆ بۆ خۆت هەمووت خواردۆتەوە و، بەشی منت نەهێشتۆتەوە. گوتی خودایە ئەمن پێیەوە هەراسان بووم، حەوت ساڵە بەکۆڵێ دەیگێڕم و عەزیەتی دەگەڵ دەکێشم، یاڕەبی مارەکە تێی بڕشێتەوە بەڵکو بیدەمێ و پێی بمرێ ئەمنیش لە دەستی نەجاتیم دەبێ و، سەرفراز دەبم.

خودا دوعاکەی لێ قەبووڵ کرد و ئەو مارە بەئیرادەی خودای لە کەڵەکەکەی هاتەوە





دەرێ و، دەقاپەکەی ڕشاوە و ئەو شیرەی خواردبووی بۆی تێکردەوە. دەو ئەسنایەیدا میران لەخەو هەستا و گوتی: برایم، کوا پێخۆرت هێناوە؟ برایم گوتی: بەڵێ بۆم هێناوی. دەشیزانی ئەو مارە تێێ ڕشاوەتەوە بەڵام هیچ بێز و بۆی لێ نەدەکرد. نانەکەی بۆ دانا و، میران گوتی وەرە برایم بخۆ. برایم گوتی: ئەمن زۆرم برسی بوو دڵیشم نەهات لە خەوێت هەستێنم، بەشی خۆم خواردووە و ئەوەندەشم بۆ تۆ هەڵگرت کە ئەگەر لە خەو هەستای بیخۆی. میران دەستی بەخواردنێ کرد، هێشتا بەتەواوەتی لێ نەبۆوە هاواری برایمی کرد و گوتی: کوڕە برایم، بەپەلە بمگەیەنە ئاوەدانییەکی ڕەنگە بمرم، ئەوە هەر دڵم پێکدادێ و بەدەنم موچوڕکان دەدا نازانم بۆچی وام لێهات! هەرچۆنێکی بوو برایم میرانی گەیاندە بەر هەیوانی مزگەوتی ئاوەدانییەکی و لەوێ داینا.

میران بەدەنی بلۆقی دەرکردن، زنچکاوی لێ هات و ئەو بلۆقانەی هەموو دڕان هەموو ڕۆژێ برایم دەچوو لێرە و لەوێ نانی بۆ دەهێنا و نزیکەی چاردە پازدە ڕۆژان خزمەتی کرد.

وردە وردە میران ملی نا لە توێخ هاویشتنێ، بەدەنی سپی بۆوە و توێخەکانی چابوونەوە بەکورت و کرمانجی حەلەمی خوای لێ بڕا و یەک دەردی تێدا نەما. ئەوجار بانگی برایمی کرد و گوتی: برایم، ئەمن ئەوە چاک بوومەوە و غەل و غەشم لێ بڕاوە و بوومەوە میرانی جاران، ئێستاش برالە چونکە ئەو برایانەی من ئەمنیان وەدەرنا و تۆش ئاوا پێم وەفاداربووی، شەرت بێ کە شەرتی خۆم بەرمەسەرێ. (دەڵێن ئامۆزاکەشی کە کوڕی میر عەزەمێ بوو لە قوڵە سمۆرێ بوو، ئەگەر میرانیان بەکۆڵێ دەبرد ڕای نەدەگرت. جا میران شەرتی کردبوو کاغەزیشی دابوو بە برایمی کە ئەگەر مردم خاتوون ئی تۆ بێ جا کەیفت لێیە لەخۆتی مارەکە، ئەگەر چاکیش بوومەوە شەرت بێ بەشەرتی خودای ئەمن بەماڵی دونیایە ژنێ بێنم و با خاتوونیش هەر ئی تۆ بێ. دیارە میر حەج و میر شێخیش بەو شەرتەیان زانیبوو.) بەڵێ کە میران چاک بۆوە گوتی شەرت بێ ئەو مەملەکەتی کە میر شێخ و میر حەجی لێ بێ، ئەمن نەیچمێ (میر حەج و میر شێخ لە هەولێر و کۆیە بوون). جا دەسەری کردن و بەشە ماڵی خۆی لێ ئەستاندن. ئەوجار هێنای نۆکەر و دەستوپێوەند و قەرەواش و نۆبەدار و ئەوانەی سازکرد. هاتە ئەو غومارۆیەی و مڵکەکانی کڕین کە ئێستا «سەرچاوەی ڕەبەتێ»ی پێدەڵێن. ئێستاش وارشە و قەڵاکانی غۆمارۆی هەر ماون و کانییەکانی دیارن. کانیە ژنان بەجوێیە و ئی پیاوان بەجوێ، هەردووک بەرامبەری یەکن.

بەکورتی میران لەوێ دەوڵەمەندبوو، ئەوجار برایمی لەسەر نۆکەری لابرد و بەچاوی

سووک چاوی لێ نەدەکرد چونکە وەفای بۆ میرانی زۆر بوو. ئامۆزاکانی کە زانیان میران چاک بۆتەوە ئەوجار وردە وردە هاموشۆیان دەکرد و خۆیان دەگەڵ ڕێکخستەوە و فەسادی و شەیتانیان لە برایمی دەکرد. چونکە دەیانزانی میران قەولی پێداوە خوشکەکەی خۆی بداتێ. بە میرانیان دەگوت: عەیبە ئەتۆ خوشکی خۆت دەدەی بە نۆکەر و ورکەخۆری بەردەرکی خۆت. خوشکی خۆت بدە بە ئێمە و، ئێمەش خوشکی خۆمان دەدەین بەتۆ چونکە ئەتۆش ژن و ماڵت دەوێ. وردە وردە بەو قسانە میرانیان لە برایمی وەرگێڕاوە و، قەستی کوشتیان تێکرد.

برایمیش پیاوێکی ڕەشید بوو. گوتی شەرت بێ بەشەرتی خودای ئەگەر کوڕی میر عەزەمێ هاتنە ماڵە میرانی ئەمن لەسەر کانییە غومارۆیە دەست دەملی خاتوونێ بکەم با بزانم ئەو سەگبابانە دەتوانن چ بڵێن و چم دەگەڵ دەکەن با ئەمنیش دۆست و دوژمنی خۆم بناسم، دۆستەکانی برایمی پێیان گوتبوو کە وریای خۆت بە چونکە خەریکن بتگرن ئەتکت پێ بکەن یان بەفێڵێکی بتکوژن. بەهەرحاڵ برایمیان وشیار کردبۆوە.

ڕۆژێک ئامۆزاکانی میرانی پەیدابوون. برایمیش ئەو وەخت و سەعاتەی کە ئەوان هاتبوون چۆ سەر کانیە غومارۆیە و دەستی دەملی خاتوونێ کرد. ئەوانیش دووربینیان دا بەدەست میرانی و گوتیان؛ تەماشای کابرای نۆکەرت بکە چەند بێ ئەدەبە، ئەمە نەمانگوت زووی سەر پان کەوە؟ چاو چەند بێ ناموسە، ئابڕووی تۆ چۆن دەبا. بەپەلە دوو نۆکەریان ناردن کە برایمی بکوژن یان، بیگرن دەوەتاغێدا ئەتکێکی پێ بکەن (ئەڵبەتە ئەو دوو نۆکەرە دۆستی برایمی دەبن). جا ئەوە برایم بەو جۆرە بەندەکان دەڵێت:

ئەوە برایم دەڵێ دەچوومەوە کن میرانی ساڵێکی لە ساڵان هەر لەوێ دەهەوەڵێ بەژنی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەوی شەنگەدارێ.................

بۆنی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەوێ گیابەند و خاوێ

ئەگەر شەو با شەریەتی لەسەر وارشی دەگەڵێ

چاوی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی کاروان کوژێ ئەگەر دوو سەعات و نیوی دەپێش ئەستێرەی ڕۆژێدا، کەی، لە برایمی قەلەندەر هەڵێ

ئەوە برایم دەڵێ ئەمن دوێنێ ئێواری چاوم بەخاتوون دەکەوت بێت و، دوو قسەم دەگەڵ نەکا ناژیم بەژینێ، دەمرم، هەر دەمگاتێ دەردی ئەجەلێ.

**





برایم قەتی قسەی بێ ئەدەب نەکردبوو، ئەو ڕۆژەی کە ئەوەی بەخاتوونێ دەڵێ، خاتوونیش خۆی لەسەر بەناز دەفرۆشێ و جوابی بەناحەزی دەداتەوە. برایمیش دەڕوا:

ئەوە خاتوون دەڵێ برایم ئەو قسانە مەکە، ئەو قسانە مەڵێ

ئەمن بڵێم بەفەڕاش و نۆکەری میرانی دەتکوژن، زگت هەڵدەدڕن بەخەنجەرێ

برایم زیز دەبوو هەر لەوێ و، لەوێندەرێ.

خاتوون دەیگوت: قەرەواشێ کارگەرێ ئەمن جوانێکی وەک برایمی مەلا زێندینێم لێ زیز بووە لەو دونیایەی، نازانم داخودا لەو دنیای دی لە ئاهی برایمی چم لێ بەسەرێ.

ئەوە قەرەواش بەپێی پێخواسی دەردەپەڕیە دەرێ

دەیگوت برایم مەڕۆ، محەمەدی ئەمینم هێنایە تکایێ

برایم دەڵێ: قەرەواشێ کارگەرێ، قەول و قەرار هەر ئەوەبێ هەر کەسێکی زیز بووان وەگرێڕێ دەبێ تۆق و تەلەسمێ خۆی بداتێ و بینێتەوە دەلایەکی دەباغەڵێ.

**

ئەو قەرەواشەی خاتوون بەدوای برایمی دانارد، زۆری لەبەر پاڕاوە و گوتی: خاتوون ناردوومی و گوتوویەتی ئەوجار نەڕوا و، ئاشت دەبینەوە با بگەڕێتەوە.

برایم گوتی: بەو شەرتەی ئاشت دەبمەوە ئەگەر نیشانە و مۆر و سجیل و حیسابی خۆی بدا بە من، ئەوی هەیەتی. بەو شەرتەی دەگەڕێمەوە دەنا دەڕۆم، شەرتیش بێ چۆن میرانی برای لە کۆیە ڕۆیشت و سوێندی خوارد کە تازە نەچتەوە ئەو وڵاتەی چونکە میر حەج و میر شێخی لێن، ئەمنیش چونکە ئەو قسەی پێگوتم لەو وڵاتەی نەمێنم و بچمە وڵاتێکی دیکە. بەڵام قەرەواشەکە بوو بەعۆدەدار و، بەو شەرتەی کە باسکرا برایم دەگەڵی گەڕاوە.

ئەوە برایم هەڵدەوەشاوەو هەر لەوێ و لەوێندەرێ دەگەڕاوە کن خاتوونێ

خاتوون لەبەر خۆی دادەڕنی قەتارەی فەرەنتیان، ڕێزەی دەبابەکریان جلەوی دەبوغزیان دەیدانەوە بەبرایمی دەیگوت: ها، برایم بیاننێوە دەلایەکی دەباغەڵێ

هەر دەو دەمی دا و دەو سەعاتیدا، قاسید لە دەرووی غومارۆڕا دەهات، دەیگوت برایم وەرە میران گازت دەکاتێ، دەڵێ دەست داتەوە گوێزانێ ئەوە دەمرم لەبەر ژانی سەرێ

برایم هەڵدەستاوە دەچۆوە دیوانی میرانێ

ئەوە دەستێکی دەبرد بۆ تانجی، دەستی دی دەبرد بۆ مێزەرێ

بەختی برایمی هێندە ڕەش بوو نێرەی دەترازا لەبەر کەمبەرێ

تۆق و تەلەسمی خاتوونێ دەیانکرد بەخڕمێن و قارقارە دەکەوتن لەوێندەرێ.

ئەوە میران دەیگوت برایم ئەوە چن؟

دەیگوت کاکە میران بەسەری تۆ ئەوە دوێنێ خاتوونێ خوشکت گەسکی لە فەڕشان دابوو، ئەوانەی نابوونە وەدەتاقەی دەرێ ئەمنیش هەڵمدەگرتن دەمنانەوە دەلایەکی باغەڵم

دەمگوت نەوەک ناکەس بەچەیەک دەستیان بداتێ بەنائەمینی بیانباتەوە دەرێ

میران دەیگوت برایم، ئەگەر وایە هەردایاننێوە لەوێندەرێ.

**

چونکە برایم بەگولی دەگەڵ میران گەڕابوو، سەر و ڕیشی بۆ خاوێن کردبۆوە و شیوی بۆ کردبوو، کە چاکیش ببۆوە هەر لە دوای برایمی دەنارد ئەگەر ژانە سەرێکی گرتبا. دەیگوت پێی بڵێن چەقوی بێنێ و، بێ.

کە میران پیاوی بەدوادا نارد لەو دەمەیدا تۆق و تەلەسم و هەموو ئەو شتانەی کە لە خاتوونێی وەرگرتبوون دەبەر پشتێندەکەی دابوون (جا ئەگەر دەڵێ نێرەی دەترازا لەبەر کەمبەرێ، مەبەستی گرێی پشتێندێیە.) ئەوە بوو کە قاسید هاتوو گوتی بە برایمی کە میران دەڵێ سەرم دێشێ بێ سەرم بتاشێ. ئیدی برایم تۆق و تەلەسمەکەی لەبەر پشتێندێ نا و چوو سەری بتاشێ جا کە بەدەورەیدا دەهاتوو دەچوو تۆق و تەلەسمەکەی لێ بەربوونەوە. ئەوجا میران دەڵێ: ئەوە ئی خاتوونێن، بۆچی بەتۆن؟ برایمیش قسەکەی وا دانا و گوتی: دوێنێ گەسکی لە وەتاغی دەرێ دابوو. ئەو تۆق و تەلەسمەکەی کە دەتاقەی نابوون لەبیری چوونە و، ئەمنیش هەڵمگرتن و پێم نەکراوە بدەمەوە بە ماڵێ، ئەوە هەر پێمن. گوتم نەوەک کابرایەکی خەیانەتکار و ناکەس بەچە دەستیان بداتێ و عالەم لە دوایە تووشی سوێندخواردنێ بن.

میران گوتی: جا زۆر چاکە، لەوێیان دانێوە خاتوون نەیزانیوە، هەر ئێستا هاوار دەکا.

برایم لەترسان بەدزی خۆی گەیاندە خاتوونێ.

ئەوە برایم هەڵدەوەشاوە لەوێ و، لەوێندەرێ





دەچۆوە کن خاتوونێ دەیگوت خاتوونێ بەژن باریکێ کەڵەکەتی خوێن شیرینی زێڕکەمبەرێ

ئەو موقەدەرەی بەسەر من هات، ڕەبی ئەوانەی خودا و پێغەمبەری ناناسن وەکو ئەمنیان لێ بەسەرێ

ئەمن دەچوومەوە دیوانی کاکە میرانت دەستێکم دەبرد بۆ تانجی دەستی دیم دەبرد بۆ مێزەرێ

بەختی برایمی هێندە ڕەش بوو نێرۆم دەترازا لەکەمبەرێ

تۆق و تەلەسمی تۆ دەیانکرد خرمە و قارقارە هەردەکەوتن لەوێندەرێ

میران دەیگوت: برایم ئەوە چن؟

دەمگوت کاکە میران: ئەوە بەسەری تۆ دوێنێ خاتوونێ خوشکت گەسکی لە فەڕشان دابوو، ئەوانەی نابوونە دەتاقەی دەرێ

ئەمنیش هەڵمگرتن و دەمنانەوە لایەکی باغەڵم، دەمگوت نەوەک ناکەس بەچەیەک بە نائەمینی دەستیان داتێ، هەر بیانباتەوە دەرێ.

ئەوە خاتوون دەڵێ برایم: خۆ من نەمزانی ئەتۆ نۆکەرێکی هێندە ترسنۆک و ناکەس بەچەی.

بۆ دڵۆپە خوێنێکی دەپاڕێیەوە، ئەلحان دەچمەوە دیوانی کاکە میرانم ئەو خەجاڵەتی و شەرمەزارییەی لەسەر تۆ دەبەمەوە دەرێ

ئەوە خاتوون دەپێی خۆی دەکرد جووتێک گۆرێی چەن و جووتێک کەوشی شافی هەر لەوانی دە ئیراتی، بەسەر سەری دادەدا چارشێوێکی بەغدا زەمین ڕیشوو نیو گەزی لەوانی سێ قەڵاتی

سەبر، سەبر، نەرم نەرم دەچۆوە بەرپەنجەرەی میرانێ دەیگوت:

کاکە میران بڵێ بەکوێخای جارچی، جارم بۆ بکێشێ لە وڵاتی

ئەمن دوێنێ گەسکم لە وڵاتی دابوو، تۆق و تەلەسمم نابوو دەتاقەی دەرێ

بەڵکو بیکەن بەسندووقی سەری تۆ بۆم باوێنەوە ئەوێندەرێ.

ئەوە میران دەیگوت خاتوون برایم نۆکەرێکی بەسەری من و تۆ ئەمینە ئەو هەڵی گرتبوون و نابوونیەوە دەنێو لایەکی باغەڵێ

خاتوون دەڵێ کاکە میران ئەگەر دەزانی برایم بەسەری من و تۆ ئەمینە تۆ بۆی دروست کەوە کالانی دەخەنجەرێ

ئەو تۆق و تەلەسمەی بۆ خۆت ئاگاداری سەروەختیانی

ئەمیش دەیدەمێ بۆ زریزەو و دووپشکەی دەخەنجەرێ

ئەوە برایم بە چاوانی چاو لێدەکا بە برۆیانی حاڵی دەکا بۆ سەر کانی غومارۆیە

ئەوە خاتوون دەستی دەدا ئافتاو گومگومەی حەیدەر بەگی

سەبر سەبر و نەرم نەرم دەچۆوە بۆ سەر کانی غومارۆیە

دەستنوێژێکی هەڵدەگرت و نوێژێکی دەکرد لەوانی چوار ڕەکاعەتی

برایم بەسەرشانی خۆی دادەدا کەوڵێکی بەغدا زەمینی نیقەدگاری لەوانی سێ قەڵاتی

سەبر سەبر و نەرم نەرم دەچۆوە کن خاتوونی سڵاوێکی لە خاتوونێ دەکرد، ئەوە سێ جارانی زیارەت دەکرد سووچی بەردەتاتی

خاتوون دەڵێ وەعەلێکمە سەلام و ڕەحمەتوڵاهی، برایمی مەلا زێندینێ

هەر لەوێڕا هەتاوەکونێ ئێرە سەر چاوی خاتوونێ قەلەندەرێ بابان وێران دەهاتی.

کورە خانە خەراپ شەوی دەشەواران و ماڵە دۆست و برادەران لەمن و تۆ ببووە بەقاتی،

بۆ بەنوێژی نیوەڕۆیە لە ژوانی خاتوونی قەلەندەری بابان وێران دەهاتی

کوڕە خانە خەراپ میران پێ بزانێ دەرمان دەکا بەچلەی دەزستانێ

بەمانگی کانوونێ هەر بەسۆدرەی دەوڵاتی

ئەوە خاتوون دەڵێ برایم ئەوە بۆ وا زەردی، بۆ وا زەنوێری، بۆ وا کزی هەر دەڵەی لەژێر قەبرانڕا دەهاتی

برایم، دەنێرم کەوات بۆ بێ دوگمە لەسەر خەیاتی

بەخودای برایم ئەمن لێوی تۆم گەلێک پێ جوانترە لەو موشەجەریانەی ئەگەر کوڕە مفردیان هەڵی دێنن لەسەر دووکانی بەمقەستێکە دەسک ڕاجع بۆ قەراغی سیخمە و قەراغی لێ هەڵدەنگاوتی

ئەمن برایم حەوت ساڵە جووتێکم شەمامە و شەمامە ڕەنگینی پاوان کردوون و





حاشارداون لە نوراڵی خانی ئامۆزام بەعام سیخواری نێوانی هاوینێ و پاییزێ هەر سەریان لێ هەڵدەنگاوتی

ئەوە برایم دەهاتەوە کن خاتوونێ بۆ خۆی و خاتوونێی ڕادەخست سووچێکی کەوڵی بەغدا زەمینی لەوی سێ قەڵاتی

ئەوە دەستی دەستۆی دەکرد و سمێڵی بەخورمایی لەسەر کولمەی زەرد و سووری خاتوونێ دەبزاوتن. شەقەی ماچی برایم و خاتوونێ هەروەکو دەمانچەی هەر دەنگی دەداوە لە وڵاتی

ئەوە کوڕی ئەمیر عەزەمی بە دووربینێکی بلوور بەگی، سەرتەقی کانی بەچاو دەنگاوتی

نەیدەوێرایە دەستە و خەنجەری بچنێ، دەچوونەوە دیوانی میرانی قسەیان دەکردن بەفیتنەوە هەرزومەتی بەفەسادی.

**

بەڵێ جا دەو دەمەیدا ئەو کوڕانە کە دەبنە ئامۆزای خاتوون و میرانی فیتنەیی و شەیتانیان دەکرد لە برایمی کە لەنێوی بەرن و ئەتکێکی پێ بکەن لەو کاتەشدا کە ئەوان هاتن ڕابردن بۆ ماڵە میرانی برایمیش لە داخی وان چوو دەستی دەملی خاتوونی کرد. ئەوانیش چوون دووربینیان دا بەمیرانی و، گوتیان ئەتۆ پێت وابوو ئەمە درۆیە دەکەین. تەماشاکە کابرایەکی ورکەخۆری دەرکی خۆت چۆن دەستی لە ملی خوشکەکەت دایە. لەپێش چاوی عالەمێ بەنوێژی نیوەڕۆیە لەسەر کانی غومارۆیە. میرانیش دەیزانی برایم پیاوێکی ڕەشید و جەسوورە و، دەست دەکاتەوە دوو نۆکەری بانگ کردن و گوتی بڕۆن برایمی بانگ کەن بەڵام هیچ قسەی پێ مەڵێن. تەنیا ئەوەندە نەبێ بڵێن میران کاری پێتە و بانگت دەکا. کە دوو نۆکەرەکان لە وەتاغی میرانی هاتنە دەرێ خاتوون چاوی لێ بوو، دیارە ترسێکیشی دەزگی دابوو. بەبرایمی گوت: ئاخر خودا غەزەبتە نەمگوت بەنوێژی نیوەڕۆیە مەیە ژوانی من؟ ئەوە کاکم دوو نۆکەری ناردن. کە نۆکەرەکان هاتن بانگی برایمیان کرد و قسەیان دەگەڵ دەکرد.

ئەوە خاتوون دەڵێ:

برایم ڕەبی خانەت خەرابێ ماڵت وێران بێ ئەتۆ سەرت هەڵێنە، سەرت لە کەوڵی غەز بێنەوەدەر بزانە ئەو دوو کوڕە مفردیانە کێن لە دیوانی کاکە میرانم دێنەدەرێ بەپەلە

ئەوە برایم دەیگوت: خاتوون مەترسێ یەکیان برای دایک و بابیمە ئەوی دیکەشیان برادەرە، دەهاتنەوە کن برایمی دەیگوت برایم ڕەبی ماڵت خەرابێ خانەت وێران بێ شەوی دەشەواران و ماڵە دۆست و برادەران لە تۆ و خاتوونێ ببووە بەقاتی

بۆ بەنوێژی نیوەڕۆیە لە ژوانی خاتوونێ قەلەندەرێ بابان وێران دەهاتی

خانە خەراب کوڕی ئەمیر عەزەمێ بەدووربینێکی بلووربەگی سەرتەمی کانیەیان بەچاو دەنگاوتی

نەیان دەوێرایە دەستە و خەنجەرت بێنێ دەهاتنەوە دیوانی میرانی قسەیان دەکردن بەفیتنە و هەرزومەتی بەفەسادی

ئەوە برایم دەڵێ براله وەکو بزانن دەمکوژن یان دەمبڕن یان دەرم دەکەنەوە لەکاولە وڵاتی

یان دەمنێرنە سەر عێلان، عاشیرەتان پێم دەستێنن سووریاش و، شەکەزەکاتی

ئاغایان لە سەفەرێ دێنەوە لە نۆکەری خۆیان زیاد دەکەن خەڵات و بەراتی

یان لەنێو دۆست و دوژمناندا بەسەر شانی منی دادەن کەوڵێکی بەغدازەمینی نیقەت گاری هەر لەوانی سێ قەڵاتی

دەیانگوت نازانین نەدەتکوژن، نەدەتبڕن، نەدەرت دەکەنەوە لە کاولی وڵاتی

ئەوە برایم هەڵدەستا دەچۆوە دیوانی میرانی سڵاوێکی لە ئەهلی مەجلیس دەکرد، ئەوی بەبرایمی دۆست بوو دەیگوت: وەعەلێکمە سەلام و ڕەحمەتولاهی برایمی مەلا زێندینی هەر لەوێرا هەتاوەکونێ ئێرە سەرچاوی ئێمە دەهاتی

ئەوەی بەبرایمی دوژمن بوو هەروەکو ژنێکی حیز لەبنەوە هەرلیچیان لێ دەبزاوتی.

**

کە برایمیان برد بۆ دیوانی میرانی، بۆ خۆی دەیزانی یان دەیکوژن یا ئەتکی دەکەن و نێفەکی دەبڕن یان عەیبێکی تووش دەکەن. لە ڕێیە فکری خۆی کردەوە، کۆسەی خەنجەرەکەی ترازاند و گوتی: ئەمن ناچمە نێویان بێ شکوا دابنیشم، دەرکی پێشخانەی دەکەمەوە و دەردی دڵی خۆم هەڵدەڕێژم. با ئەمن دۆست و دوژمنی خۆم بناسم، بزانم کێیە ئەو فەسادیەی لەمن دەکا و پەی سەری من کەوتووە تاوەکونێ ئەمن تووشی ناڕەحەتی بکا.

کوڕەکانی ئەمیر عەزەمێ خەریکی ئەوە بوون ژن بەژنەی بکەن و ساختەیەکی بۆ





برایمی ساز بکەن هەتا لەنێوی بەرن، کەچی برایمیش ئەو هەموو زەحمەتەی کێشاوە و قەولی خاتوونێشیان پێداوە.

جا ئەوە برایم دەرکی پێشخانەی گرتووە و ناچێتە ژوورێ نەوەکو سواری سەری بن، میرانیش غەزریوە. برایم هەر بەپێوە دەردی دڵی خۆی دەڵێ و، کەس جوابی ناداتەوە:

ئەوە برایم دەیگوت کاکە میران سەری من دێشێ دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ نەکاوێ

ئەمن نۆکەرە خوێڕیەکەم لە ماڵێ نەبوو دەچوومەوە بۆ کانێ غومارۆیە بۆ سەتڵێکی دەئاوێ

ئەوەی لەسەر کانێ غومارۆیە بوو، خاتوونی خوشکت نەبوو کچی ئەمیر عەزەمێ بوو پڕی دەسرۆکێکی بۆ دەنارد هەردووعا دەگەڵ سڵاوێ.

**

ئەوەی برایم گوتی جنێوێک بوو بەوانی دا بەڵام یەک ناوێرن دەنگێ بکەن چونکە بۆ خۆیان برایمی دەناسن، برایمیش ئەوە هەر شکۆیان دەکا:

ئەوە برایم دەڵێ کاکە میران سەری من دێشێ دڵی من ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ نەکاوێ،

ئەتۆ ئاغایەکی بەشەو دەکەی ڕەشەڕاوێ کەیفت لێ بێ دەمخنکێنی بەزیندانان، بەمەیدانان، ناوەڵا بەشەپۆڵی دەئاوێ

ئەوە برایم دەڵێ: کاکە میران سەرم دێشێ دڵم چەندی لە دەراودەرە

توخوداکەی یان وەرە بمکوژە یان بمکە دەربەدەرە

خۆ من گوناهی خۆم گەلێک زۆرن با گوناحی برادەرانیشم نەیەتەوە سەرە.

ئەوە برایم دەڵێ: کاکە میران سەرم دێشێ دڵم ڕاناوەستی لەبەر ئەوێ ژانێ، ئەوە دەترازێنم کۆسەی خەنجەرم هەڵدەکێشمە دەبانێ

خۆ ئەمن ئەلحان بیست و چوار کەلاکت بۆ دەخەم لە گۆشەی دەمەیدانێ تازە دەرکراو و دەربەدەر بووم لەسەر تاق تاقە ماچی خاتوون پەری خانێ.

**

جا، کە برایم ئەو قسانەی کردن میرانیش لێی ترسا، گوتی وەڵاهی وا چاکە جوابی بدەمەوە بەجوانی نەوەک دەستمان لێ ببزێوێ، هەمووومان دەکوژێ.

میرانیش بەو جۆرە جوابی دەداتەوە دەڵێ:

ئەوە میران دەیگوت برایم ئەگەر دەهاتێوە ئەو دەرکە بەقوڕێ گیراوەی من، ئەو حیزە فێڵانەت دەگەڵ نەبان وەگیر نەدەکەوتی نە لەعەرزی نە لە حەوت تەبەقەی ئاسمانێ

بەخودای برایم ئەمن سامی تۆم گەلێک بێ گەورەترە لەو حاکمەی ئەگەر حەو ساڵانی دەکردەوە حوکماتی شاری بانێ

ئەمن برایم لێت ڕادەوەستم بەمانگی کانوونێ بە چلەی دەزستانێ

خاتوونێ دەنێرمەوە بۆ گەرمێنێ ئەتۆش دەنێرمەوە بۆ کوێستانێ

ئەگەر قاسید حەوت گۆچانی پۆڵا بشکێنێ، حەوت کاڵەی ئاسن بدڕێ، هیچوو بەسۆراغی هیچوو نەزانێ.

**

بەڵێ جا میران پێی گوت: شەرت بێ دەرت دەکەم بەڵام ئەوڕۆت دەرناکەم، ڕۆژێکت دەردەکەم کە هیچ کەس نەتوانێ بچێتە ماڵە جیرانی خۆی. ئەمن ئەتۆم پێ پیاوێکی زۆر حیسابی بوو، فەقەت نەدەبوو ئەتۆ ئەو نا ئەمینیانە دەگەڵ من بکەی.

خاتوونیش ئەوە بێ خەبەرە لەوەی کە بەهانەیان بەبرایمی گرتووە و ئەوە دەری دەکەن و قسەی پێدەڵێن، کە خەبەریان بۆ برد گوتی: خودا غەزەبت لێ گرێ برایم، هەدات نەدا هەتا پاش ئەو هەمووو خزمەت و چاکەی. ئەوە پاداشتت بوو دایانیەوە.

ئیدی خاتوونیش چارشێوی لە خۆی هاڵاند و هاتە بەر پەنجەرەی کاکی هەتا لێی بپرسێ و، بزانێ بۆچی بەو زستان و قیامەتەی دەری دەکات؟

ئەوە خاتوون دەپێچی خۆی دەکرد جووتێک گۆرەوی چەلو جووتێک کەوشی شافی هەر لەوانی دەئیراتی

ئەوە بەسەر سەری دادەدا چارشێوێکی بەغدا زەمینی ڕیشوو نیوگەزی لەوانی سێ قەڵاتی،

سەبر سەبر و نەرم نەرم دەهاتەوە بەر پەنجەرەی میرانی دەیگوت کاکە میران خۆ من نەمدەزانی دەرکردنی برایمی هێندە موتڵەقە دەنا ئەمن بۆ برایمیم دەکری وڵاغێکی گوڵ گوڵی لەوانی سم تەبەقە

ئەوە کەلی مێرگە چەکۆیە و مۆڵی بەرانان و سەری دانغاڵان پەری کوێستانی عەزیمەت و گەورە و گرانی پێ کردباوە شەق و پەقە





خۆمن خەمی ئەوەم نییە ئەتۆ برایمی دەردەکەی بەمانگی کانوونێ، بەچلەی دەزستانێ

ئەمن خەمی ئەوەمە، ئەوە بەهارێ عێل دەکەنەوە گەرمێن و کوێستانێ.

داخوا چ کوڕە دۆمێک، چ کوڕە مفردێک بەنووکە چەکمەی دەسەری هەڵدا و بڵێ:

ئەوە چ کەڕە کرمانجێکە، سەرما بردوویە دەگەڵ ڕاو و ڕووت و تاڵانێ

ئەدی نازانێ ئەوە برایمی مەلا زێندینێ دەرکراو و دەربەدەر بووە لەسەر تاق تاقە ماچی خاتوون پەریخانێ

ئەوە برایم دەڵێ: سەرم دێشێ دڵم ڕاناوەستی لەبەر ئەوێ جغارێ

خۆ من نارۆمە دەرێ لەوان حەوشەیان لەوان حەساری

هەتاوەکونێ بۆ خاتوونێ دانەنێم هەر قەولێ دەگەڵ قەراری

ئەوە برایم دەڵێ: خاتوون سەرێ من دێشێ دڵی من چەندی لە نەهاتی

بەخودای کاکت ئەو پیاوەتیانە دەداتەوە، ئەو ڕۆژانە وەبیرناکا ئەگەر گول ببوو، گول پارێزی لێ دەکرد و حەوت ساڵان بەکۆڵێم هەر دەگێڕا دەوڵاتی

ئەوە میران دەڵێ: برایم سەرێ من دێشێ دڵی من چەندی لە دەراودەرە

ئەتۆ خۆت نەدیبوو دەگەڕای دەشاریدا کەس نەیدەگرتی نە بەغوڵام و نە بەشوان و نە بەنۆکەرە،

جووتێک کەڵاشە کۆنت دەپێ دابوون و پەستەکۆنێکت دەبەرکردبوو، لاقانت، سەری قامکانت لە کڵاشی هەر لە من سەریان دێناوە دەرە

ئەوە خاتوون سەرێ من دێشێ دڵی من چەندی لەکزی

ئەتۆ وەرە دەگەڵ میرانە گولەی برات وڵاغم بۆ وەگۆڕە خۆ ئەمن زامنی هەزار و پێنسەد زێڕت دەدەمێ هیچ گوێم لەبن کەلی بەفرێدا نەڕزی

ئەوە برایم دەڵێ سەرێ من دێشێ دڵی من چەندی لەکزی

ئەتۆ بێنە بیست و چوار ماچم دەیە دوازدەیان بەئاشکرایی دوازدەشیان بەدزی،

خۆمن زامنی هەزار و پێنسەد زێڕانت دەدەمێ، هیچ کوێم دەبن کەلی بەفرێدا نەڕزی.

**

بەڵێ جا هەتا ئەو هەمووو چەند و چوون و کێشە و گلەییانەیان لە یەکتری کردن بوو بەنوێژی شێوان.

کابرایەکی سەڕاج دەدێیەکەیان دابوو، چەند ساڵ بوو چەرمەگایەکی بەملدا مابۆوە، خاتوون چۆ لای کابرای و گوتی دەبێ لەقایش و ئاغزوونە و لە بولغاری باڵتەیەکم بۆ دروست کەی لە بۆ برایمی، لێم مەعلوومە کاکم دەری دەکات لە ڕۆژێکیشدا دەری دەکا کە هیچ کەس نەتوانێ بچێتە لای جیرانی خۆی. هەڵبەتە بەکوێستانێشدا دەڕواتەوە بۆ ماڵە میر حەج و میر شێخی، دەبێ باڵتەیەکی وام بۆ سازکەی کە ئەگەر دەبەر برایمیم کرد سەرما کاری لێ نەکات.

کابراش لە خۆشی ئەوەی کە قایشەکەی لە کۆڵ دەبێتەوە، هێنای باڵتەیەکی زۆر چاکی بۆ ساز کرد و دەبەری کرد.

ماڵی میر حەجی ماینێکیان هەبوو لە جانووەکەیان هەڵبڕیبوو. جانووەکە لە کۆیە بوو ماینەکەشیان هێنابووە ماڵە میرانی تا وشک بکات جا لە دوایە بیبەنەوە. ئەو ماینەش بەحری بوو دەنا هەموو ولاغێک لەو ڕۆژەیدا و بەو کوێستانەیدا برایمی بۆ نەدەچۆوە ماڵە میر حەجی. هەڵبەتە خاتوونیش ماف و ئیرسێکی لەکن میرانی بوو، جا ئەگەر میران برایمی بەچلەی زستانێ دەرکرد خاتوونیش هێنای بەکابرای مەیتەری گوت: دەبێ ئەو ماینەی بەدەستوورێکی زۆر جوان زین بکەی. میرانیش نەیدەوێرا دەنگێ بکا.

بەنوێژی شێوان ولاغەکەیان بۆ برایمی ڕاگرت و کابرای سەڕاجیش باڵتۆکە و ئەو چەند قایش و ئاغزوونەی کە دەگەڵی ساز کردبوو، هێنای کە دەبەر برایمی بکەن و بەڕێی بکەن. هێشتا برایم باڵتەکەی دەبەر نەکردبوو هێنای ئاوزەنگی بەتاڵ کرد و سوار بوو، ئاوزەنگیش بۆ خاتوونێ بەتاڵ کرد. خاتوون پێی دە ئاوزەنگی نا و، سەرکەوت بیست و چوار ماچی لە پێش چاوی برا و دۆست و دوژمنی دا بە برایمی و خوا حافیزی لێ خواست. بەقەرەواشانیشی گوت: بێنن سێ چوار گۆزانم ئاوێ بگەیەننێ.

باڵتەکەیان دەبەر کرد، زۆر جوان قایمیان کرد و دایانبەست سێ چوار گۆزەشیان ئاو پێدا کرد. ئەگەر ئاوەکەیان پێدا کرد، برایم گوتی: دەبوایە ئاوەکەم پێدانەکەی، سبحەینێ دەڵێن: وەڵا برایمیان بەچەپڵە ڕێزانی منداڵان لە غومارۆیە دەرکرد و ئاویشیان پێداکرد خاتوونیش گوتی: ئەتۆ دەبێ ئەمنت مەنزووربێ، ئەتۆ ڕێگات زۆر سەختە و، کوێستانە ئەو قایشانە توند دەبن و پێکەوە دەیبەستن، دەنا ئەتۆ ناگەیە ماڵە کاکم. بێهۆش دەبی و بەردەبیەوە و لە جێگایەکی تێدا دەچی، هەر بۆیەشم ئاو پێداکردی. بەڵێ جا بەو جۆرەی برایم خواحافیزی کرد و ڕۆیشت.

ئاغاوەت شەوێ دەچنەوە ئەندەروون و دیوی ژنان. یەک دوو سەعاتی شەو مابوو میر حەج خەونی دیت، دەخەوێدا پێیان گوت: میر حەج ئەگەر نەچێ دەرێ میوانت سەرما





دەیبا و قەتڵت دێتە ئەستۆی. میر حەج کە هەستا دوو قەرەواش لە پێشخانەی بوون، بەقەرەواشەکانی گوت: دا هەستن، بچن سەرێکی دەرکی دەرێ بدەن و هەستێکی ڕاگرن بزانن کەس لەپشت دەروازەی نییە.

قەرەواشەکان هاتنە دەرێ شەوێکی بەکرێوە و تەم و مژبوو، سەیرێکی دەرکی پێشخانەیان کرد و نەیانوێرا بچنە دەرێ. لێیان بوو بەسەتوخورت و ملیان لە قسان نا، یەکیان گوتی: وەڵا ئێوارێ ئەگەر ئەو کرێوە نەبایە ئەمن قەولم بەکوڕی ماڵە فلان کەسی دابوو کە بۆی بچمە دەفلان قەلاغی. ئەوی دیکەش گوتی: وەڵا ئەمنیش قەولم بەفلان کەسی دابوو بۆی بچمە کاولی ماڵە فلان کەسی بەڵێ قەرەواشەکان هاتنەوە لێی نووستن. دیسان میر حەج خەونی دیتەوە و سەرلەنوێ پێیان گوت: میر حەج ئەگەر هەڵنەستی میوانت سەرما دەیبا و قەتڵێکت دێتە ملی.

هەر بەو دەستووری میر حەج دیسان قەرەواشەکانی هەستاند و پێی گوتن: بچن سەرێکی حەسار و دەرک و بانی وەتاغێ و دەروازەی بدەن، بزانن کەس لە پشت دەروازەی نییە و کەس هەرا ناکا.

قەرەواشەکان دیسان لەترسی سەرمایە نەیانوێرا بچنەدەرێ.

سەرلەنوێ میرحەج خەونی دیتەوە بەڵام ئەوجار بۆ خۆی هەستا خۆی کۆکردەوە و هاتەدەرێ، ئەگەر تەماشای کرد ولاغێک هاتۆتە حەسارێ و ڕاوێچکەی دەکا و دێت و دەچێ. بەپەلە بانگی قەرەواش و نۆکەرانی کرد و چرایان هێنا و لەدەوری کۆبوونەوە. سەهۆڵی پرچی ماینێ لە سینەبەندی ولاغێ قایم ببوو، تەنگەی زینەکەیان هەڵبڕی و بەئاوی گەرم برایمۆیکیان لە زینەکەی کردەوە، ئەگەر بەرگەکەیان لەبەر هەڵدڕی ئەوجار بۆیان مەعلووم بوو ئەگەر ئەو سوارە برایمە. میر حەج و میر شێخ زۆر ناڕەحەت بوون، گوتیان: وەڵاهی یان خاتوون مردووە یان میران، دیارە قەزیەکی زۆر گەورە ڕووی داوە دەنا بەو زستانەی برایمیان هەڵوەدای ئێرە نەدەکرد، مەعلووم شتێک قەوماوە، برایمیش لە حاڵی خۆیدا بوو هیچ هۆشی نەمابوو.

میر حەج ڕووی لە کوێخا و ڕدێن سپیان کرد و گوتی: ئاخۆ بڵێی بژیت؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ، ئەمە لە پێشینیانمان بیستووە کە ئەگەر کەسێک کەسیرە بوو سەرما بردی دەبێ حەمامی ژنانی بۆ بکرێ، ئەگینا بیبەنە بەر ئاوری هەر دەمرێ و دڵی لەخۆ دەبێتەوە، دەبن کورسیشدا هەر دەمرێ. بەڵام ئەگەر حەمامی ژنانی بۆ بکرێ بەئەسپایی و، وردە وردە دەبووژێتەوە.

میر حەج بۆ خۆی دوو ژن و کچێکی هەبوون هێنای لە دەوری برایمۆکی وەرگرتن و دانیشتن. برایم وردە وردە دەبووژاوە و دەجوولاوە. هێشتا تەواو لەسەر هۆشی خۆی نەبوو ملی لە جنێوان نا دەگەڵ میرانی. ئەگەر چاوی هەڵێنا وردە وردە هەموو شتێکی وەبیرهاتەوە و زانی دەرکراوە. چاوی بەمیر حەجی کەوت ناسییەوە، لە خەجاڵەتیان خۆی مراندەوە.

میر حەج گوتی: هەستە خۆت مەمرێنە، ئەمن ئاگام لە قەرار و وادەی تۆ دەگەڵ میرانی هەیە و دەزانم چتان کردووە و کاغەزێکتان هەیە. هەستە شەرت بێ بەشەرتی پیاوان ئەگەر پەڵەڕەشانگ دەکوێستانێ کەوێ و ولاغ دەرچێ، ئەمن خاتوونت بۆ دێنم و دەتدەمێ. جا برایمیش هەموو شتێکی بۆ میرحەجی گێڕاوە.

میر حەج دیسان گوتی ئەگەر پەڵەڕەشانگ دەولاتی کەوێ و ولاغ دەربچێ خاتوونت بۆ دێنم. برایمیش ڕۆژێ دەچوو پولی دەدا بەمندالان کە بچن پەین و خۆڵەمێشی لەسەر تیرەگی کوێستانان ڕۆبکەن تا میر حەج چاوی پێی بکەوێ و بلێ ئەوە پەڵەڕەشانگ دەولاتی کەوتووە و بچێ خاتوونی بۆ بێنێ.

دەڵێن میر حەج بەئەجەلەی ئەو زستانەی هێنای کچێکی لەبرایمی مارە کرد هەتا برایم بێ بناوان نەبێ. (هێندێک دەڵێن کچی خۆی بوو، هێندێک دەڵێن کچی مەلای بوو ئیدی ئەوە مەعلووم نییە) ئەوجار لەپەنای ماڵەخۆی دیوێکی دایە و ماڵ و حاڵێکی بۆ سازکرد.

برایم پیاوێکی ماقووڵ بوو، ئەوانیش خۆشیان دەویست و ڕۆژانە دەگەڵ خۆیان دەگێڕا و پێکەوە دامەیان دەکرد. بەڵام بەهیچ جۆرێک خۆی دەوکچەی نەدەگەیاند کە بۆیان گواستبۆوە، بۆ خۆی شیو و شتی دەکرد و ئەگەر هەر شتێکیشی ویستبا هەر خۆی هەڵدەستا. شەوانیش ئەو لە سووچێکی دیوەکەی دەنوست و کچەش لە سووچەکەی دی. ئاخیری کچە بەخۆی نەوەستا و لێی وەجواب هات و گوتی منیان بەتۆوە سەرگەردان کردووە و تۆش هیچ خۆم تێ ناگەیێنی، ئاخر خۆ من بێ کەس و بێ کارە نیم.

برایمیش لەبن لێوێوە گوتی: وەڵاهی فلان کەس، خۆ من نازانم ئەتۆ بێ کارەی یا نا. فەقەت ئەمن سوێندخۆری خاتوونێم و، هەتا لەوی خاترجەم نەبم ناتوانم ڕوو دەکەس بکەم و بلێم ئەتۆ خێزانی منی.

کچە زۆری پێ ناخۆش بوو. هەستا چۆکن خوێندەوارێکی جا میرزا بوو یان مەلا،





نامەیەکی پێ نووسی بۆ غومارۆیە بۆ لای خاتوونێ کە دەبێ لایەکی سەری لەوێ بشۆی و لایەکی بێنیە ئێرە. تەونێکمان هەلاوەسیوە و ئەوە بەدارێوەیە، لێمان ئالۆز بووە و بەکەس نایەتەوە سەردار ئەگەر نەیەی ئەوە هەموومان لێ دەبێتە زەرەد.

کاغەزەکەی ئاوا نووسی و مۆری میر حەجی لێدا. بەلێ. کاغەز گەیشتە غومارۆیە و چونکە میر حەج برا گەورە بوو میران نەیتوانی خۆ بگرێ، هێنای بێگارچی زۆری ڕەگەڵ خست. وەک دەڵێن بەدوولمەدان (نمەدان) بەسەر بەفراندا بردیانە کۆیە.

ئەو کچەی کە ئەو نامەیەی نووسیبوو، دەیزانی نامەکە دەگات و خاتوون ناتوانێ گیربێ، قاسیدی لەودیوی مالان دانا و گوتی: ئەگەر دونیا بوو خەڵکێک هاتن و ژنێکیان پێ بوو. فەقەت ژنەکەی بێنە نێو دێی و بەعالەمەکەی بلێ بگەڕێنەوە. ئەڵبەتە میر شێخ و میر حەج لەو بێگاریەی بێ خەبەر بوون. ئەو کچە ئەو فێڵەی سازکرد و حەقێکیشی دەدا بەو قاسیدەی کە لەسەر ڕێگایەی دانابوو.

کابرای قاسید کاتێکی عالەمەکەی دیت کە ژنێکیان پێیە و بەرەو دێی دێن بەپەلە خۆی گەیاندنێ و گوتی: کاکە هەرچی بێتە نێو دێی دوو سەد شەقی وێدەکەوێ، میر حەج و میر شێخ لەسەر ئەو بێگاریەی بەشەڕ هاتوون. میر شێخ گوتوویەتی ئەتۆ بەو زستانەی بوویەتە باعیسی گیانی ئەو خەڵکەی، دەبوایە ڕاوەستێ هەتا ولاغ دەردەچوون ئەوکات دەماننارد خاتووڼمان بۆ بنێرن. فەقەت ئێوە بگەڕێنەوە و ژنەکەی بەجێ بێڵن. بێگارچیش کە پێیان خۆش بوو زوو نەجاتیان بێ، خودا حافیزیان کرد و خاتوونیان دایە دەست کابرای. کچەش واتە ئەو کچەی دابوویان بەبرایمی لە دەروازەی ماڵە میر حەجی ڕاوەستابوو، هەر کە خاتوون گەیشتێ دەپەنای خۆی گرت و بردیە دیوەکەی برایمی.

جا کە خاتوون چووە ژوورێ هەر بەو جۆرەی کە ژن عادەتیانە دەستی بەپرسیاران کرد و گوتی: کوا تەونەکە لە کوێ هەڵواسراوە؟ بۆ لێو خەرابوو، کێ وەستابوو؟

کچە گوتی: کچێ وەستای چی و، تەونی چی و حاڵی چی؟ ئەوجار سەرلەنوێ وەزع و حاڵی خۆی بۆ گێڕاوە و گوتی ئێستاش ئەتۆم بۆیە هێناوە بەڵکو نەجاتم بێ لە چنگانی، وەڵاهی شەوێ لەترسانی خەوم لێ ناکەوێ، دەڵێم نەوەک بمخنکێنێ.

خاتوون کە دیتی برایم خۆی لەو کچەی نەگەیاندووە هێندە پێ خۆش بوو لە خۆشیان قاقایەکی کێشا. لەو کاتەیدا سەری میر حەجی لەسەر ڕانی برایمی بوو کە حەکایەتی بۆ دەکرد، برایم کە گوێی لە قاقای خاتوونێ بوو سەری میر حەجی فڕێدا عەرزی و

بەندێکی تێ هەڵکرد کە دەڵێ:

ئەوە برایم دەڵێ: سەری من دێشێ دڵی من ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ ژانێ

ئەوڕۆکانە کەس بە بابێوە ڕێی ناکەوێ سەری لەسەر ڕانی من دانێ

ئەمن ئەوڕۆکانە کەس بەپیاو نازانم، کەسم پێ پیاو نیییە چونکینێ لەبن گوێم خۆش دێ هەر قاقای خاتوون پەری خانێ.

**

جا کە برایم سەری میر حەجی گرت و فڕێیدا، میر حەج لێی ترسا و گوتی: برایم ئەوە بۆ سەرت فڕێدام؟ برایم گوتی: ئاغا خودا شاهیدی حاڵە گوێم لە قاقای خاتوونێ بوو، زۆرم بدوێنی دەتکوژم، ئەمن ئەتۆ نە بە ئاغا و نە بە پیاو نازانم. میرحەج لێی ترسا و گوتی: وەڵاهی ئەوە شێت بووە هەربۆیەش خاتوون و میران لێی وەڕەزبوونە، دیارە کەللەی خەرابووەوە و ئەو ئەحواڵەی بەسەری دادێ. گرێوێکی دەگەڵ دەکەم و دەی لاوێنمەوە و هەردووک دەستانی دەپەڕێنم، فەقەت چونکە خزمەتێکی زۆری کردووین بەخێوی دەکەم هەتا دەمرێ. ئەوە دەستی هەبێ خەراپە، ئەوجار سەری فڕێداوم جارێکی دیکە بەخەنجەرێ لێم دەدا و دەمکوژێ وا چاکە دەستانی بپەڕێنم چونکە ئەگەر دەستی نەبێ هیچی پێ ناکرێ.

جا بانگی کرد و گوتی: برایم ئەتۆ سەری منت فڕێدا، براڵە ئەگەر خاتوون لێرەبوو ئەمن ئەو ڕۆژەی ناکەم بەشەو، مەلا بانگ دەکەم و خاتوونێت لێ مارە دەکەم و داوەتێت بۆ دەگرم، ئەگەریش خاتوون لێرە نەبێ هەرتک دەستتانت دەپەڕێنم. (ئەوە ناشزانێ ئەو کچە بەفێڵ خاتوونی هێناوەتەوە ماڵێ) بەڵێ جا کاغەزێکی دەنووسن دەمەعبەینی خۆیاندا و هەرکیان ئیمزای دەکەن.

کە دەنێرنە دیوی ئەو کچەی کە داویانە بەبرایمی دەبینن ئەوە خاتوون لەوێ دانیشتووە.

میر حەج بانگی خاتوونی دەکا و دەڵێ: بەو زستانەی لەچی دەگەڕێی کێ بەتۆی گوتووە وەرە و لە چی دەگەڕێی؟

خاتوون دەڵێ: کاکە ئەدی ئەتۆ کاغەزت لێ نەنووسیبووین کە ئەوە تەونمان هەڵاوەسیوە و لێمان خەراپ بووە، وەرە چاکی بکەوە؟

میر حەج زۆری پێ سەیر دەبێ و، واقی وڕدەمێنێ. دەڵێ ئەمن شتی وام نەنووسیوە.





وەپێشینەی وەی دەکەون خەڵکی بێنێ ئەزیەتیان بکەن و ئیقراڕیان لێ وەرگرن تا بزانن کێ ئەو کاغەزەی نووسیوە. لەو دەمەیدا کچە هەڵدەداتێ و دەڵێ: ئاغا کەس نارەحەت مەکەن، ئەتۆ ئەمنت بەزۆری لە بابم ئەستاندووە و داوتم بەو کابرایەی. ئەو پیاوەش لەو ڕۆژەوە لێی مارەکراوم تا ئێستا ئاویشی پێ تێنەکردووم. ئەمنیش لێی ترسام و لە ترسی ڕوحی خۆم کاغەزێکم لە زمانی تۆوە نووسی و مۆری تۆم پێوەناوە بۆ غومارۆیە کە خاتوون بێ تەونمان دەگەڵ بکا، بەشکم ئەتۆ خاتوونێی بدەیەی و، ئەمنیش نەجاتم بێ.

کە کچەکە ئەو قسانەی کرد و لەبەر ئەوەش کە شەرتیان دەگەڵ برایمی کردبوو بەکاغەزی و ئیمزا، میر حەج هێنای بانکی مەلای کرد و خاتوونی لێ مارەکرد، داوەتی بۆ سازکرد و گوازراوە.

***

## ئازیزە

١

ئازیزێ، دەوەرە ئازیزە جوانێ، سینگ سەدەفێ مەمک فینجانێ،

چاوڕەشێ برۆ قەیتانێ، دایک حدودێ باب کەحلانێ،

بەوانت سوێند دەدەم ئەگەر هەڵدێن لەسەفی دەعاسمانێ،

بەوان حەرفان کەم ئەگەر هەڵدەستێ لە قورعانێ،

بەوان گەورە کیژان دەکەم ئەگەردێنە دەرێ، لەوێ ماڵێ لەوێ خانەدانێ،

ئەگەر نەمدەنێ بەژنێکی باریک و زەندێ بەبازن، لە خۆم حەرام دەکەم نان و ئاوی کاولە ئێرانێ، ئازیز.

**

ئەوە کوڕ دەڵێ کیژێ ئەمن پیر نەبووم پیرت دەکردم، دەردەدار نەبووم دەردەدارت دەکردم، ڕەنگ زەرد و لێو بەبارنەبووم ڕەنگ زەرد و لێو بەبارەت دەکردم، دەتکردم بەتۆزێک بەبانانت وەردەکردم، بانان وە خۆیان هەڵنەدەگرتم گردەبایەکی شەماڵ دەهات لێی دەدام و بە بەحری وەردەکردم، هەر کیژێ لەوان گەورە ماڵ و نەجیم و خانەدانان دەهاتن دەئافتاوێ گەروماڵیان ڕادەبردم، هەموو ئێواران و سبەینان، سەحەریان، سینگ و مەمی خۆیان پێ دەشوشتم، ئازیز............

٢

ئەوە سـەرێکی منی مـاڵ وێران دێشێ دڵێکە من بەوەیە، بەکـابەی شـەریف بکەم، بەخـالقی گـەورەیە، لەشکرێک لەمن دیارە لەشکرێکی گـەورەیە، گـەورە و عـوندەیە، لەشکری کـێیـە و کێ نییـە؟ ئەگـەر نازانی، دەیگوت پێنسـەدی تورکـە و تورکـمـانە، پێنسـەدی فەلەیە و، فەلە ڕەشکەیە، پێنسـەدی نیزامی خـاسەیە، چیـیـان پێیـە مـاڵی ئاگری؟ دەیگوت ئەگەر نازانی پێیـانە تۆپ و تۆپخانێ، تیری سەر بەپەیکانە، تفەنگی هەوەڵ کـارخـانە، دەداتەوە بەسـەر زینوێ شـێـخـەکـەی باڵـەکـاندا. تاڵان دەکـا حـێلی حوربادی، بادەداتەوە سەر ئەوێ ماڵە حاجی برایم ئاغای بەحیلی.

کیژ گاز دەکا: هەتیوە، لاوەکە غەمێ تاڵان و ماڵێ مەبە وەرە من و تۆ لێک بهاڵێین سێ شەوان بەشەوی دەپاییزێ، دوو ڕۆژان بەڕۆژی دەبوهارێ، وەک تولەکی دەنەمـامێ، وەک غەڵفی دەچنارێ، وەک گوڵی دەلاولاوێ، هەر بۆ من و تۆ گەلێک گـەلێک خۆشترە لە خەراجاتەکەی شاری کاولە بەحللێ.

ئازیز وەی لێ...............

ئازیزێ دەوەرە وەرە من و ماڵە بابم ئەمن لە بۆت هەڵدەڵێم بەکوێستـانی دەسێو سوور و، گەنمان، بەکۆزیلەی بەرخان، بەکـۆزلەتی شاڵە بەگیـان، بەسپی سـەنگی موکریان، بەقەندیلە گچکەی مامە کۆییان.

ئەوە قـەندیلم دەیگوت: ئەمن قـەندیلم، بەفرێ خۆ کۆناوکۆن وەکۆ هەڵدەگرم، گـاکری مەیدان چوغان دەیگوت ئەمن گەلێک گەلێک سازگار ترم. ئازیزێ...........

٣

ئازیزێ ئەمن بۆت هەڵدەڵێم بەڕنوو، ڕنووی دەبەفرێ و گـوڵ گـوڵی دەمێرگێ، ئەگـەر نێوی دەمە کن وی لە سێزدە ساڵ و چواردە ساڵی، لێدەگرنەوە، پیرۆ پیرۆی لێدەگرنەوە بەنێڵە لێی هەڵدەکەنن چڵ چڵ لەوی گیـابەندێ، ئەو کیـژ نییە هەرامـە پیرە خاڵە، خۆ ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێم بەقـەندیلە گچکەڵەی مـامە کۆیان دەیگوت هەتا بەفری نوێم لێ دەبارێ هی کۆنم لێ دەماوە

ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێم بەئەشکەوتی کـەڵوانی ئەگەر سەرە بەهاران ئەوە شـوانکاران، هەرسێ بەرەی گەلاڵانیان هەڵدەداوە.

ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێم لە بۆ کـانیلەی کـانی کـەنێـرێ، ئەگەر خـۆ من بەهارم گـەلێک





گـەلێک پێ دەخـۆشن لەبەرفـیکە فـیکی شـوانان، لەبەر بێـڵـە بێڵـی شاخداری، ئەوان بێریان چاویان دەڕەشن برۆیان دەبکولاوە

لەوان بێریان لەجێ کۆچێ دەماوە

گۆمیلکە گۆمیلکە عارەقی لەناو سینگ و مەمکان دادەماوە

کـیژ دەڵێ ئەگـەر بێـتو گـوڵێکی دەمـێردانی لێ بخواتەوە لەبۆی دەبێتـەوە سندان و ژەهرەمارە ئەگەر هەتیوە لاوکیشم لێ بخواتەوە، لەبۆی دەبێتەوە قەنداو و شەکراوە.

٤

ئازیزێ، وەرە وەرە مـن و مـاڵە بـابم ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێـمـەوە بەکـوێسـتـانی دەبرایم گەلاڵی ئەگەر سەرە بەهاران، شوانکاران وەسەر دەکەون لەبۆ کەمبەری دەکوێستـانێ، هەریەکی بەخۆی و، بەسێ چوار هەزار سەر مەڕ و ماڵێ

ئەمن لەبۆت هەڵدەڵێم بەوێ حاجی حەمـەدی مـاڵ لە ئەسـتـەمبـوڵی، ئەگـەر وەسـەر دەکەوێ لەبۆ سێبەری دەکوێستـانێ دەبێتـەوە گـەورەی پێنسەد و بیست و دوو چادر و ڕەشماڵێ

خۆمن لە بۆت هـەڵدەڵێم بەوێ حەمـەدی شێـرە قـولەی ئەگـەر لەبەر شۆخ و شـەنگیـان ملکی لەسەر پەتوێکی حەجێ ڕادەماڵێ

دەک ڕەبی ئازیزێ بەژنی باریکت لەبۆ من بمێنێ بەباری حونێ

پـانی پێت بـەمـن بمێنێ بەقـــەیسی دەهەڵـوینی، بەلـەکت بـەمـن بمێنێ بەهـوررەی دەهەلاجی، سینگت بەن بمێنێ بەکاغەزی دەمەرجانی چاوت بەمن بمێنێ بەوێ ئەستێرەی کە هەڵدێ لەنێوانێ هەور و سامالێ

بڕۆت بەمن بمێنێ بەپانە پەڕ و بەجغەی دەڕەشەدالێ

زوڵفت بەمن بمێنێ بەئاوریشـمی خـاسـە ڕەنگ ئەگـەر لە مـانگ و سـاڵ کـەوتۆتەوە دەیبەن دەیفرۆشن لەشاری دەگەرمێنێ بەکاردێنەوە کیل و مینەقی بەمسقاڵی،

جا ئەو جار ئەمن دەچم بۆ گەڵی ئەوێ نێو نێڵی، ئەوێ نێو لێڕەواری

لە شـەکـینێ، لە دارەبەنێ، لە مــازوو داری دارەبەنم دەبینی بەڕووتی کـەوتبـوون بەڕەزالی،

دەمگوت تۆ خـودا بەنێ ئەتۆ بۆچی وا ڕووت و ڕەجـالی؟ دەیگوت نازانم بۆچی وا ڕووت و ڕەجالم.

ئەگەر لەنێوانی بەهار و زستانێ شین دەبووم لە لێرەواری

ڕاوچی دێتن کەوی نێرم پێوە دەخوێنن دەست دەکەن بەوێ گرمە گرم و ساز و سەمتوور و هاوار هاواری

ئەگەر ئەوەڵی پاییزێم شەختە لە جەنگەی پاژنوێژان هەڵدەکاتە گوڕەگوڕی پیرە شەماڵێ پێم هەڵدەوەرێنێ هەر لەبۆ سەر ئەوێ چۆم و شەت و کاولە ڕووباری، ئازیز...........

٥

ئازیزێ، ئەمن دەچووم لێم دەپرسی: دارەبەن، ئەتۆ بۆچی وا ڕووت و ڕەجاڵی؟ دەیگوت ئەتۆ نازانی ئەمن بۆچی وا ڕووتم، وا ڕەجاڵم ئەگەر لەنێوانی بەهار و هاوینانم شینکم، لێم دەست دەدەنە تەشوێ دەگەڵ ئەوێ تۆپەڵە قوڕێ

بەجێم دێڵن لە ساردی پاییزێدا بەنەخۆشی، بەزەلیلی، بەکەسیفی بەبرینداری، ئەگەر ئەوەڵی پاییزێم دادەداتەوە نمەنمەی دەبارانێ، هەتا پەڵەی پاژنوێژانم لێ دەکاتەوە گوڕەگوڕی دەپیرە شەماڵی، ئەوەڵێ پێم هەڵدەوەرێنێ هەر لەبۆ سەر ئەشکەوتی دەدانخاڵی

دەوەرە ئازیزێ ئەمن فەلاتم دەگەیشتنێ کەلێک گەلێک فەلاتی دەگەورە و گرانە،

هێندێک دەڵێن: بابەکەی بابم ئەوە سەدایە پیرە پاییزێیە هێندێک دەڵێن: نەخێر، هەر بایە بارانە،

هێندێک دەڵێن: بەفرە، بوومەلەرزەیە ئاخری زەمانە،

هێندێک دەڵێن: ئاجووج و باجووجە، هێندێک دەڵێن: دەجالە حەجی سۆفیانە،

هێندێک دەڵێن: نەخێر ئەوە حەزرەتی مووسایە، هەموو ڕۆژێ لەسەر کێوی تووری هەزار و یەک کەلیمەی دەڵێ لەخزمەت بینایی چاوانە.

هێندێک دەڵێن: حەزرەتی ئیسرافیلە فو دەکا بە نەفخی سووردا دونیا دەبێتەوە تەخت و مەکانە،

هێندێک دەڵێن: بابەکەی بابم ئەوە ئاخری زەمانە، ئازیزێ...............

٦

ئاخ دە وەرە وەرە ماڵە بابم ئەوە سەری من دێشێ، دڵێکی منی ماڵ وێرانێ بەبرینە





برینە،

ئەگەر یاری من ناناسن، بەلەکی هەی هەلاجین، پانێی قەیسی هەلۆینین، لێوی ئەتلەسن، ددانی مروارین. ئەمن دەچوومەوە گوڵ گوڵی دەکابەکی پۆلێکم پۆڕ هەڵدەفڕاندن، هێندێکیان سۆنە و مراوینە، هەر دەهاتن لە باژاری دەنیشتینە.

گەلێک پارێزم بۆ دەبردینە، دەهاتن لە مێرگان دەنیشتینە، لە مێرگی دەشین شینە، ئەگەر لەوێم پارێز لە بۆ دەبردینە لەوێ هەڵدەستان دەهاتن لەدەشتی «وەزنێ» دەنیشتینە، ئەگەر لەوێم پارێز لە بۆ دەبردینە دەهاتن لەمێرگی «دەکەوپەڕ»ێ دەنیشتینە ئەگەر لەوێم پارێز لەبۆ دەبردینە لەوێ هەڵدەستان دەهاتن لە گوڵ گوڵی دەخێڵێ دەنیشتینە، ئەگەر یارێ من ناناسن هەموو سەبای سبەینان دێتەوە دەرێ بەکراسێکی پەشمین پەشمینە.

٧

وەرە ئازیز، ئەرێ دە وەرە من و ماڵە بابم ئازیز

ئەوە دڵێکی منی ماڵ وێران بەبێرە بێرە

ئازیزم چاوێکم لێ دەکات بەمانگ و یەکێکم لێ دەکات بەئەستێرە

دەڵێ هەتیوە لاوکە نازانی، ئەتۆ کاوڕێکی بەماڵە بابی من بسپێرە

هەموو ڕۆژێ لەبەر کاوڕەکە وەرە بۆ ئێرە

بەباسکانتەوە بگرەوە لادێر، لادێرە

بەڵکی فەقیانەت ئەویش بەکەتانم دەگەڵم بکەوە هاوێر هاوێرە

بیست و دوو ڕامووسان لەگەردنی ڕەنگینی حەلیم بەگی بژمێرە

سەد بری بەبری دەخودای بوایە ئەمن دارێک بام لەداری دەشەنگەبی برەستابام لەبەر دەرکی ماڵە بابی کوڕە لاوەکەی حەیرانی لکێکم ڕۆیشتبا لەبۆ گەرمێنی دەگەرمەسێرە

بیست لکی دیکەم ڕۆیشتبا لەبۆ کوێستانی خاڵ خاڵ و زەنوێرە

لەبن لکی کوێستانم بهاتایە دانیشتبان ئەوسەپان و، ئاغا و، نۆکەر و جوندی و جوامێرە.

٨

ئازیزێ، ئەمن لە بۆت هەڵدەڵێمەوە بەکوێستانی عەزیزم و ڕەنگین و خاڵی خاڵێ.

ناوەڵا لەبۆت هەڵدەڵێمەوە بەوێ حاجی عەزیزی ماڵ لە گەرویسێ، ئەگەر بەهارانی دراوی هەموو دەبەشێوە لە عالەمێ پاییزان خڕی دەکردەوە بەتەلیس و جەواڵێ

خۆمن بەغیلیت لەبۆ دەبەم بەگولەگولەی مێردانە ئەگەر دەحەدە حەدەی نیوە شەوێ بەڕیشی شەق دەکا ، بەسمێڵێ چڵماوی ئەرێ عارەقی لە سینگ و مەمێ ئازیزە جوانی من و دەماڵان ڕادەماڵێ.

***

## بەیتی ناسر و ماڵ ماڵ

وێژەر: محەمەد باڵەکی

ئەوە بابەکەی بابم سەرێ من دێشی دڵی من چەندی لەمن وێرانە ئەوە من ئەوڕۆکانە بابەکەی بابم ئەتۆ زەینێکی خۆت لەمن بدەوە تیلەگی دەکوێستانی گاگەش و گاگەش بابۆمەران

کاکە ناسر بەسەری تۆ ئەوە ئەوڕۆ لێیداوە لەمن گزینگی تاوێ ئێستاکە لەبنی سێبەرێ

ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر ئەتۆ زەینێکی خۆت بدەوە ئەو بەرەوبەری گاگەش و گاگەش بابۆمەران

لێی هەڵدراوە تاوڵ و چادر و چی قوڵ قوڵ وتیپە تیپە لەمن سەرانسەرە

ئەتۆ ئەوڕۆکانە زەینێ بدەوە تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم.

سێ تەیر لەسەریان بەستۆتەوە لەنگەرە

ئەوان تەیرانە یەکیان بازە، یەکیان شەهێنە ئەوی دەدیکە پیرە سەقرە لەدیارە

ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر بەسەری تۆ ئەتۆ بۆ زەینی خۆت نادەیە تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم وێران ئەگەر هەڵدراوە لەسەر چاردە چەڵەکەی بن زێوی ناوەڵا لەمن سەریان بەپەنجەرە

دەدەوری تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم وەرگیراوە بیست و پێنج چیغی دەسمەر پێنج لەمن سەرانسەرە

تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم ئەوڕۆکانە سێ کیژی تێدان لەوان کیژانە یەکیان نازەنینە یەکیان خاتوونە ئەوی دەدی خاتوون ئەسمەرە





ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر بەسەری تۆ خوشکی گەورە ئەوە سێ ئەنگوستیلەی دەدەستی دان ئەوان ئەنگوستیلان یەکیان لەعلە یەکیان دوڕە ئەوی دەدیکەیانم لەمن پیرە گەوهەرە

خوشکی گەورە دێتەوە دەرێ لەتاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم بەدەستیەوەیەتی دار کوتکێکی لەوی دەخاسە ڕەنگین دادەکوتێ لە دەورەی تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم سەد و بیست و پێنج بەرچیغی هەر لەمن سەریان بەخیزەرە

دیارە ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر دەبلێ ئەمن و تۆ شەوم شەو لەوەڕە خۆمان باوێینەوە تاوڵی مەزن بابۆمەر ئاغای مام هەتاوەکونێ مەلای مەزن بابۆمەر ئاغای دەچێتەوە دەگردەکەی دەگرخم خانێ دەڵێ ئەڵڵاهو ئەکبەرە ئەوە ناسر بەمن دەڵێ بڕۆ ماڵت شێوێ ماڵ ماڵە تۆ بابە سەری تۆ نازانی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم تازە بەوخەبەرەی زانیوە

ئەگەر بێتو بەنائەمینی بەبەردەرکێدا بڕۆی چون ئەو چاردە کوڕی شوانی هەیە ئەگەر یەکی سندەگلێکمان پێدا بدەن هەردەمان بڕنەوە ئاسارە.

جا ئەگەر وا دەڵێ ماڵ ماڵ زۆری ڕق هەڵدەستێ دەڵێ هەستە سواربە دەی، بەڵێ هەڵدەستن بەینێکی تەقلێ و ڕمبازێ دەکەن لەوی واوە هەرسێ کچی مەزن بابۆمەر ئاغای ڕوو دەمێرگە نەخشینان دەکەن. ئەوانیش ڕوو دەوی دەکەن هەر لە هەوەڵی سبەینێوە دەیانگەوزێن هەتا فەردایێ نوێژی ئێوارێ

فەردایێ نوێژی ئێوارێ سوێندێ دەخۆن بەحەمایەڵی سوڕە قورعانی نەئەوان ژنان بێن نە ئەوان چ مێردان بکەن، بەڵێ ئێوارێ ئەوان بەجووتە سوارە دێنەوە ئەوانیش هەڵدەستن بەپەلە پەل یەکی کۆڵەپووشێکی لەتینگێ دەبەستن و دێنەوە.

شەوێ مەزن بابۆمەر ئاغا پیاویان دەسەر دەکا دەڵێ ناسر و ماڵ ماڵ سبەینێ یان شەڕ، یان لە ملکم بچنە دەرێ.

ئەوجار ماڵ ماڵ ڕوو دە کاکە ناسری دەکا و دەڵێ کاکە ناسر تەگبیر چییە؟ ئەویش دەڵێ: براله تەگبیر بەکەس چانابێ، بەوەزیری بەغدایە نەبێ. جا سبەینێ هەڵدەستن بەجووتە سوارە لێی سوار دەبن ڕوو لە بەغدایە دەکەن، کە دەگەنە دەراوی ئالانەزی تەماشا دەکا ئەو مەڕی ئەگەر خاتوون بەردی داناوە بۆ بەردەبێری، مەڕی لەسەر بێردراوە لە ماڵ ماڵی وایە قوونی خاتوونێ هەروا بەبەردەکەی وەیە، دادەنیشێ قونی لەجێ قوونی خاتوونێ دادەنێ و دەست پێ دەکا:

ئەوە بابەکەی بابم کاکە ماڵ ماڵ لەمن دەڵێ کاکە ناسرە

سەری من دێشی دڵی من چەندی لەمن وێرانە

ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر بەسەری تۆ ئەورۆ ئەتۆ بۆچی زەینێ نادەیەوە تیلەگی دەکوێستانێ دەگاگەش و گاگەش بابۆمەران

بابەکەی بابم چەندی لەمن بەشینە، ناوەڵا چەندی لە من ئەورۆکانە زنوێرە ئەوە بەسەری تۆ ئەلحانەکە لەسەر ئاوی دەگاگەش و گاگەش بابۆمەرانڕا کاکی خۆ دەبەیەوە گەرمێنێ بەقوڕێ گیراو

چەندی لەمن گەرمایە چەندی لەمن گەرمەسێرە

بەسەری تو ئێستاش تەگبیر هەر ئەو تەگبیرەیە هەستە بامن و تۆ بچینەوە کن مەزن بابۆمەران ئاغای مامم

یەکمان بچینەوە بەنۆکەری ناوەڵا ئەوی دی بەقەنەدارە

ئەوە ناسر لەمن بانگ دێڵێ وەرە ماڵت شێوێ ماڵ ماڵە تو نەکو بابت کەرە، بۆیە بۆ خۆشت هیچ تاقە پیاوەتیت لەمست نایە

پێم وایە ئەو ڕۆژانەت وەبیر نەدەهاتن ئەگەر ئەمن و تۆ دەچووینەوە دیوەخانەکەی مەزن بابۆمەر ئاغای مامم قەت بزانە کەس قونمان لەبەر دەبزێوی

ئەگەر دێینەوە دەرێ هیچ کەسمان وێڕانایە

بەسەری تۆ ئێستاش کاری تۆ بەکەس چانابێ فەقەت بەوەزیرەکەی ماڵ لەبەغدایە.

**

بەڵێ جا کە ناسر وەدەڵێ، بەجووتە سوارە لێی سوار دەبن و، ڕوو دە بەغدایە دەکەن و دەگەنە پرکانیان. ئەگەر دەگەنە بەندەنی پڕکانیان، تەماشا دەکەن ئەوە کابرایەک لەسەررڕا بەتوێی کراس و دەرپێیان بەتەقڵەکوت دێتەخوارێ.

هەرچی ماڵ ماڵ دەبێ دەڵێ: ئەو کابرایە ڕووت کراوە، هەرچی ناسریش دەبێ دەڵێ: ناوەڵا ڕووت نەکراوە. لەو قسانەدا دەبن کابرا بانگیان دەکا و دەڵێ: وەرن پیاوی چابن مەچن، ئەوە زیائەدینی دز بەخۆی و چل کەسەوە لەسەر ئەو چاردە ڕێیانە دانیشتووە، هەرکەسێکی دەستیان دەگەڵ بکاتەوە دەیکوژن هەر کەسێکیش دەستیان دەگەڵ نەکاتەوە وەک من ڕووتی دەکەن و بەرەهەڵدای دەکەن.

ماڵ ماڵ هێندەی ڕق هەڵدەستێ تەمای دەبێ بەڕمبێ لە کابرای بدا، ناسر ڕووی





تێدەکا و دەڵێ: ماڵت شێوێ خۆ هەموو کەس تاب و تاقەتێکی نییە دە مەیدانێدا. جا بەکابرای دەڵێن: کاکە وەرە دەچین ئەگەر کوژراین ئەتۆ هەڵێ، ئەگەریش نەکوژراین چەندی ماڵی تۆیە دوو ئەوەندەت بۆ دەستێنینەوە.

کابرا دەڵێ: هەی بەلاقی خێویەوە، بەحاڵێکی خۆش نەجاتم بوو، سەری خۆم بۆ دەو قاڵمە قاڵمەی داوێمەوە؟

ناسر و ماڵ ماڵ ئەگەر دەچن و تەماشا دەکەن، ئەوە چل دانە کەس لەسەر چەقی ڕێیە دانیشتوون. ناسر بانگیان دەکا و دەڵێ: خواردنی نگۆ نین، ڕێمان بەردەن. ئەوانیش دەڵێن: ڕووت بەخواردنی کوێ؟

کەوایان جواب دەدەنەوە، ناسر و ماڵ ماڵ یەکیان دەکەوێتە بەر ڕێیە، یەکیان دەکەوێتە پشت ڕێیە. ئەوانیش بیستیان دەکەونە بەر ڕێیە، بیستیان دەکەونە پشت ڕێیە. شەڕ دەست پێدەکات. ناسر و ماڵ ماڵ پازدە بیست کەسیان لێ کول و کۆم دەکەن، باقیەکەی دیکەش تەسلیم دەبن. جا دەڵێن: سەگباب ئێوە بۆچی چەند ساڵە ئەو چەتەیی و پیاوکوژیەی لەسەر ئەو چاردەڕێیەی دەکەن؟

ئەوانیش دەڵێن: خودا غەزەب لەزیائەدینی بگری هەموو خەتای وییە. ماڵ ماڵ دەڵێ: کێهەو زیائەدینن؟ دەڵێن: هیچمان هەونین، ئەو قەڵایچەی دیارە، ئەوە زیائەدین لەوێیە.

جا ئەگەر دەچێ تەماشا دەکا، ئەوە زیائەدین دەنێو دۆشەگ و لێفەی مەخمەردا بەحاڵ دیارە. ماڵ ماڵ بانگی دەکا و دەڵێ:

ئەورۆ سەری من دێشێ دڵی من چەندی لەمن کەوسەر کەوسەرە

وەرە زیائەدینی دزی قەحبەباب تۆ سەری خۆ هەڵێنە لە لێفە و دۆشەگی دەمەخمەرە،

بزانم ئەتۆ چەند ساڵە ئەو چەتەیی و پیاوکوژیە چییە دەیکەی هەی لەسەر ئەو چاردە ڕێیانەی ئەلحانەکە کەڵەگای خۆت بەشیری ڕووت ڕاوەستاوە هەر لەسەرە.

**

بەڵێ ئەگەر زیائەدین سەر هەڵدێنێ، تەماشا دەکا کابرایەکی لەسەر ڕاوەستاوە دەڵێ بێ و نەبێ، ئەوە تاجرە و ماڵێکی زۆری پێ بووە لێیان ئەستاندووە و ئێستاش ئەوە هاتووە بپارێتەوە ئەگەر شتێکی دەمەوە، لێفەکەی بەسەرچاوی دادەداتەوە. ماڵ ماڵیش ڕمبێکی لێدەدا و بەلێفە و دۆشەگانییەوە دەدروێ و دەباڵێکی دەبا. جا بانگی کابرای ڕووتکراو دەکا و دەڵێ: ڕووتە وەرە چەندی ماڵی چووتە ئەوەندەی بەرەوە، ئەمما ها ئەو

کاغەزەش بەرە بەو دێهاتەیدا بڕۆ و بڵێ هەر کەسێکی ڕووت کراوە بابچێ ماڵی خۆی بێنێتەوە و بڵێ ناسر و ماڵ ماڵ زیائەدینیان کوشتووە و ڕێش بەرەڵڵا بووە بچوون ماڵەکەی خۆتان بێننەوە. بۆ خۆشیان (ناسر و ماڵ ماڵ) دادەبەزن دوو پاشکۆی بەوەزن سووک و بەقیمەت گران دادەگرن و لە وەڵاغانیان دەنێن، هەیتێی لێ دەکەن بۆ بەغدایە.

نوێژی شێوان دەبێ، دەگەنە بەغدایە. ماڵ ماڵ ڕوو لە ناسری دەکا و دەڵێ: کەسی برای لەکێ میوان بین؟ ناسر دەڵێ: پێشینیان گوتوویانە وڵاغ مرادە، سەری وڵاغان بەردەدەینەوە ڕوویان لە هەر دەرکێکی کرد، لەوێ میوان دەبین.

بەڵێ جا دەرکە بەدەرکە و، کوچە بەکوچەی دەکەن هەتا وڵاغان سەر دەدەرکەی ئەحمەد ئاغای وەدەنێن. ئەحمەد ئاغاش وەزیری بەغدایە دەبێ. لێیان وەدەردەکەوێ و، موختەسەری وەل ئیکرام هەتا حەوت ڕۆژان ناچێتەوە بارەگایە.

وەزیری بەغدایە پیاوی دەنێرێ تا بەئەحمەد ئاغای بڵێن کە ئایا لە خەڵاتی کەمە، لە بەراتی کەمە، کەسێک قسەی پێ گوتووە. چیبە کە ئەوە حەوت ڕۆژە ڕوو لە مەجلیسێ ناکات؟

ئەحمەد ئاغاش هەڵدەستی دەچێ و دەڵێ: سەری وەزیری بەغدایەم خۆش بێ نەهیچ کەس دەتوانێ لەبەرتۆ قسەم پێ بڵێ و، نە لە خەڵات و بەراتیشم کەمە، فەرتەق دوو برای کوێستانیم ئەوە حەوت ساڵ بوو چاوم پێیان نەکەوتبوو کەچی ئەوە حەوت ڕۆژە لێم میوانن. لەمنایە (لەمن وایە) سەعاتێکە لەکن من دانیشتوون. وەزیری بەغدایەش دەڵێ مادام برات ئەو برایەبن، بڕۆ بیانهێنە.

بەڵێ ئەگەر برایان دێنێ، وەزیری بەغدایە پیاوی هێندە جوان چاک و زەریف و مەردی چاو پێ نەکەوتووە. لە تەنیشت خۆیان دادەنێ ناشزانێ چیان دەدڵی دایە. ئەوانیش هەموو ڕۆژێ دێنە مەجلیسێ و، هەر دەڵێن ئەوڕۆ نا، سبەینێ پێی دەڵێین. بەو جۆرەی هەتا حەوت ساڵان کەس لێیان ناپرسێ خەڵکی کوێن و چ کارەن و لەچی دەگەڕێن؟

پاش حەوت ساڵان ڕۆژێکی ماڵ ماڵ دەچێتە سەربانی، ئەگەر تەماشا دەکا دەوری شاری بەغدایە بەئاڵقە گیراوە، دەڵێ: وەڵاهی واچاکە بەندێکی باوێمە ناسری.

بابەکەم بابم کاکە ناسر

ئەمن ئەوڕۆ سەرێ من چەندی دێشێ دڵی من چەندی لەمن لە کەوسەر کەوسەرە،





بابەکەی بابم ئەتۆ نازانی ئەو ساڵەکە حەوت ساڵە ئەمنت هێناوەتەوە گەرمێنی دەبەقوڕێ گیراو. دەرخواردی کاکی خۆتی دەدەیەوە ئەو ئاوی لەمن دەتاڵ و سوێرە

ئێستاش ئەوە دەوری شارەکەی بەغدا زەمینێ لەمن بەئاڵقەگیراوە وەرە

بڕۆ بزانم ئەوە چ باسە و لەمن چ خەبەرە.

**

بەڵێ جا دەڵێ ئەوە دەڕۆم. ئەویش دەڵێ کوڕە ئەخە ڕۆیین نییە، کاتێکی بۆ دیاری دەکا و دەڵێ ئەگەر بەوەندەی نەگەیەوە سەرم، دەگەمە سەرت. کە لەسەرڕا دێتە خوارێ لەهەر کەسێکی دەپرسێ هیچ کەس جوابی ناداتەوە دەڵێ چما ئەوە شاری هەلووتیانە؟ ئەو سەگبابانە بۆچی جوابم نادەنەوە کە دەگاتە مەیدانێ تەماشا دەکا ئەوە وەستایەک لەسەر کورسێکی دانیشتووە و چل شاگردی دەبەر دەستی دایە. ئەو چل شاگردانە هەریەکە و ئیشێکیان هەیە، یەک شیری سەقاو دەکا یەک خەنجەران سپی دەکاتەوە و یەک وڵاغان ناڵ دەکا و یەک..... دەڵێ وەڵاهی لەو کابرا نەجیمەی خەبەرم وەدەست نەکەوێ لەکەسی دیکە خەبەرم وەچەنگ ناکەوێ، وەچاکە بەندێکی بانگ کەمە ئەو کابرایەی جا دەڵێ:

ئەرێ سەلاموعەلێکم بابەکەی بابم لەمن مامۆستا

ئەرێ مامۆستا لەمن عەسکەرە. ئەمن تەماشا دەکەم وڵاغ چاکان وڵاغی خۆیان ناڵ دەکەن

زەینێ دەدەم مەردچاکان شیریان سەقاو دەدەن

تەماشا دەکەم جحێڵان سپی دەکەنەوە ئەوە خەنجەرە

ئەمن ئەوڕۆ بەشارەکەی بەغدا زەمینێدا دەهاتمەوە خوار و هەرچەندە پرسیارم دەکرد بۆ هیچ کەس نەبوو بەمن بڵێ ئەوە چ باسە، لە من چ خەبەرە

ئەوە مامۆستا لەمن بانگ دێڵێ وەعەلێکمە سەلام و ڕەحمەتۆڵڵاهی لە من بابەکەی بابم بەخێر دەهاتی لەمن لاوەکەی بەجگەرە

ئەتۆ دەڵەی دەگوێی گایدا نووستووی، نازانی ئەوە شێخی عارەبان هاتۆتە سەر وەزیرەکەی بەغدایە

یانە خەرجی حەوت ساڵان، یان ماینێ وەزیری بەغدایە، یان دەگەڵی بکاتەوە شەڕە.

**

کە لەو گفتوگۆیەی تەواو دەبێ تەماشا دەکا دوو دەقیقەی لێ هەڵبردووە، دەڵێ ئەو کەرە بێتە خوارێ هیچ وەڵات نامێنێ. بەغاردان لەژێڵڵادێ ماڵ ماڵیش لەسەررِا ئەگەر تەماشا دەکا، کەس دیار نییە شیری لەکالانی دەردەکێشێ و دەڕوا، دەقاڵدرماندا خۆ فرێ دەدا و لەسەررِا بەغاردێ، ئەگەر تەماشا دەکا ئەوە ناسر لەژێللا بەغاردێ. جا بانگی ناسری دەکا و دەڵێ:

ئەوە بابەکەی بابم کاکە ناسر سەری من دێشێ دڵی من چەندی لەمن وێرە قایمەتی چەندی لەمن کەوسەر کەوسەرە

ئەگەر ئەلحانەکە نەگەیشتبایە و ئێرە بەحوکمی ئەو شیرەی شارەکەی بەغدا زەمینم لە بۆ دەکردێوە موستەخەرە

جا وەرە لە بۆ کاکی خۆت وەگێڕە و بزانم ئەوە چ باسە و لە من چ خەبەرە.

ئەوە ناسر لەمن بانگ دێڵێ بابەکەی بابم کاکە ماڵ ماڵ ڕۆژە ڕۆژی من و تۆیە، شێخی عارەبانە هاتۆتەوە سەر وەزیرەکەی بەغدایە

یان ئەوەتانێ خەرجی حەوت ساڵان یان ماینی وەزیری بەغدایە

یان ئەوەتانێ لەمن دەگەڵی بکاتەوە شەڕە.

**

ماڵ ماڵ دەڵێ: با دەست دەینە شیران و بچینە مەیدانێ. ناسریش دەڵێ: کوڕە ماڵت نەشێوێ بەشیران مەیدان داری ناکرێ، لێ پرسینەوەمان هەیە یەکدا بەدوو چۆن بەو عالەمەی دادەین. جا کە شەوێ ئەحمەد ئاغا دێتەوە ڕەنگی مردووانی لێ نیشتبوو. ماڵ ماڵ دەڵێ: ها ئەوە لێمان حێجزبوون؟ ئەویش دەڵێ: کوڕە ماڵت نەشێوێ ماڵ ماڵ، ئەوە حەوت ساڵە لێم میوانن بەخۆ و بەدوو وڵاغانەوە. نەبابم بابی ناسیون، نەدایکم دایکی ناسیون. ئەمن کەنگێ لێم پرسیون خەڵکی کوێن و لەچی دەگەڕێن؟ ئەگەر دە ساڵی دیشم لێ میوان بن هێشتا نالێم خەڵکی کوێن، فەتەق ئەمن کابرایەکم ئەوڕۆ وەجاغ کوێرم وەختە بۆ داراییش دەست لە وەزیری بەغدایە بستێنم ئەوە شێخی عارەبان هاتۆتە سەر وەزیری بەغدایە خەرجی حەوت ساڵان یان ماینی وەزیری بەغدایەی دەوێ یان شەڕی دەگەڵ بکا، وەزیریش پێی ئیرادە ئەو دوو لایەنانەی بداتێ. لەتەرەف وەزیری بەغدایەڕا ڕۆژێ دە کەسی بۆ دەچێ کەلوکۆمیان دەکا. قەرارە بەخۆی و براشی بچنەوە ئارامگای خۆیان، سبەینێش نۆرە مەیدانی منە سەرێکە دەیبەم و نایهێنمەوە. ئێستاش وەرن پیاوی چاک بن هەستن با بچینە کن وەزیری بەغدایە و





مەلا و قازی، با بەیەکجاری کاغەز و بدەمێ ئەو ماڵەی من بۆ ئێوە بێ و خەڵک نەیخوا و ئێوە بیخۆن. کە ئەحمەد ئاغا وەدەڵێ، ماڵ ماڵ دەڵێ حەک لەبرات نەکەوی، جا برا بۆ ڕۆژێکی وا نەبێ دەبێ ڕیخی دەقۆنێ دەی.

ئەحمەد ئاغا دەڵێ: ماڵ ماڵ ئەوەی دەگوێیی من ماوێ، سەد کەس بەمن دەڵێن ڕووی بابی ئەحمەد ئاغای ڕەش بێ بۆ پاروە نانێکی دوو میوانی بەکوشت دان. بابچینە خێوەتی، تازە کار لەوەی دەرچووە.

کە دەیانبات، خێوەت چ خێوەت! بیست خێوەت دەپێش خێوەتی ئەحمەد ئاغای دایە.

ماڵ ماڵ ڕقی هەڵدەستێ و دەڵێ: ماڵت نەشێوێ هەتا بیست شەوی دی ئەمن دەگەمە خێوەتی شەڕێ هەر دڵیشم دەتۆقێ.

دەڵێ کوڕە عالەمت پێ چییە؟ بەخودای ئەو بیست خێوەتی دەیبینی هێندەت بەجێ دێڵن دەبێ دۆینەت بۆ بکەن. ئەوانیش بەقایە ناکەن. نێوانی شەو و ڕۆژان ئەگەر ناسر سەرهەڵدێنێ و تەماشا دەکا، چادری چی و، جاو و دراوی چی؟ هێند بەجێ ماون دەبێ هۆهۆیان بۆ بکەی. ناسر دەڵێ: فایدەی نییە با گراوێ وەبیر ماڵ ماڵی بێنمەوە دەنا سبەینێ هەردووکمان دەکوژرێین و بەهیچ دەچین.

جا بانگ دەکا و دەڵێ:

ئەرێ کاکە ماڵ ماڵ ئەمن ئەوڕۆکە سەرێکم دێشێ دڵەکەی من چەندی لە من لەگلی چەندی لەگلی گلەییە

دەتۆ سەرێ خۆت هەڵێنە لەخەوی شیرن ڕەبی خەوی خێرێت بێ پێم ئەتۆ ئەو ڕۆژانەت وەبیرنایە ئەگەر لە میرگۆڵە و، مێرگە نەخشینی دەگاگەش و گاگەش بابۆمەرانمان جووتە گراوێ خۆمان دەگەوزاندن پێم دەشکاندن گوڵی هەڵاڵە و سوێسن، ناوەڵا دەگەڵ قۆپەنی لە من دەشەنگە بیزایێ.

ئەوە بەسەری تۆ ئەو بیست خێوەتەکەی ئەگەر دوێنێ ئێوارێ دەدیت لەپێش خێوەتی خۆتدا ئەلحان بیست فەرسەخ بەجێ ماوە لە دوایێ.

ئەوە ماڵ ماڵ لە من بانگ دێڵێ: وەرە کاکە ناسر سەد ماشەڵڵا لەوێ غیرەتێ ناوەڵا دەگەڵ ئەوێ جورئەتێ

ئەتۆ لەبۆ کاکی خۆ بێنە ئافتاوەیەک ئاو، من دوو ڕەکاعەتان نوێژی سبەینێ بەجێ دەگەێنم

ئینشائەڵڵا برازای شێخی عارەبانت لەبۆ دەکوژم و، دەست و پێی شێخی عارەبانت لەبۆ دەبەستم، لەبۆو دێنمەوە بۆ نێو خێوەتێ.

**

بەڵێ جا هەڵدەستێ نان و چایەکی دەخۆن شێخی عارەبان بەخۆی و برازایەوە دێنە مەیدانێ، لێکدا لێکدا مەردی تەڵەب دەکەن. ئەوانیش ڕادەکەنە ولاغان ئەگەر سواربن، حەوت ساڵیشە کە لە گاگەشێ ڕاهاتوون نەپشتی ولاغیان زینی دیوە نەسواریشیان دیوە بەهیچ بار و بابەتێکی پیاوی وەخۆ ناگرن. ناسر دەڵێ: براله بادەست دەینە شیری، بەولاغی تۆڕ مەیدانداری ناکرێ. ماڵ ماڵیش دەڵێ: دەنا وەڵاهی ئەو شەڕە بەشیرانش ناکرێ، لە دەولەتان مۆڵەت هەیە دەچم حەوت ڕۆژان مۆڵەتێ دەخوازم. ئەویش دەڵێ کەیفی خۆتە.

ماڵ ماڵ دەچتە کن شێخی عارەبان و پێی دەڵێ: براله، لە دەولەتان مۆڵەت هەیە ئێستاش ئەتۆ حەوت ڕۆژانم مۆڵەت دەیە. شێخیش دەڵێ: کاکە ئەتۆ دەڵێی حەوت ڕۆژ ئەوە ئەمن حەوت مانگ مۆڵەت دەدەمێ خۆ ئەتۆ هەر لەبەر دەستی خۆمدای، جا ئەوڕۆت بکوژم هەر حەلە، سپەینێت بکوژم هەر حەلە ئەوانیش دێن بەجوملەی ئەو حەوت شەو و ڕۆژەی ولاغان دێننەوە سەر تەعلیمی گاگەش و گاگەش بابۆمەران. شەوێ هەرچی ماڵ ماڵ دەبێ وەک دەستی کەر لێی دەکەوێ، هەرچی ناسریش دەبێ دەڵێ: هەیاران، ئەوان ولاغیان بەحرین و ئەمەش ولاغمان گۆڵە بارگینن، ئەوان هەریەکەی دوو مەیتەریان دەبەر دەستی دایە ئەمەش کەس نییە خزمەتی ولاغەکانمان بۆ بکا. نەوەڵا ئەو نوستووە با ئەمن خۆم گەوج نەکەم، با خزمەتی ولاغان بکەم و سبەحەینێ ئابڕوومان نەچێ.

بەو جۆرەی ولاغەکان دێنێت و هەتا سێ بەقل لە شەوێ دەچی وایان لێدەکات ئەگەر ڕمبیان لێدەی نەقوپێن، لەوێڕا ڕایان دەکێشێ دەچۆمیدا ئاویان دەدا و بەینێکیان دەچۆمیدا دەگێڕی دواتر دەیانهێنێ لەبن زاری خیوەتێ دەیان بەستێتەوە و دەڵێ هەتا ماڵ ماڵی هەڵدەستێنم و نان و چایەکی دەخوا، بۆ مەیدانێ وەدرەنگی دەکەوین وا چاکە بانگی بکەم. جا دەڵێ:

ئەرێ بابەکەی بابم کاکە ماڵ ماڵ بەسەری تۆ ئەوڕۆکانە سەری من دێشێ دڵی من چەندی لە گلی گلییە ئەتۆ سەری خۆت هەڵێنە لەخەوی شیرین ڕەبی خەوی خێرێت بێ ئەتۆ ئەو ڕۆژانەت وەبیرنایە ئەگەر لە مێرگۆڵە و، مێرگە نەخشینی دەگاکەش و گاگەش بابۆمەرانمان جووتە برا ئاویلکێ خۆمان دەگەوزاندن پێم دەشکاندن گوڵی هەڵاڵە و





سوێسن ناوەڵڵا دەگەڵ قۆپەنی لەمن دەشەنگە بیزایێ

ئێستاش بابەکەی بابم ئەوڕۆکە لە پێشێکە خۆمان نەکەین بەخوێڕێتی نێومان دەگەڕێتەوە دەدنیایێ

ئەوە ماڵ ماڵ لەمن بانگ دێڵێ وەرە بابەکەی بابم کاکە ناسر سەد ماشەڵڵا لەوێ غیرەتێ ناوەڵڵا دەگەڵ ئەوێ جورئەتێ ئەتۆ لە بۆ کاکی خۆت بێنە ئافتاوەیەک ئاو ئەمن دوو ڕەکاعەتان نوێژی سبحەینێ بەجێ بگەیێنم ئینشائەڵڵا دەست و پێی شێخی عارەبانت لە بۆ دەبەستم، لە بۆو دێنمەوە بن ئەوێ خێوەتێ.

**

بەو جۆرەی هەڵدەستن و ڕادەکەنە مەیدانێ بۆ تەقلەی و تەڵەبی مەردی مەیدانێ دەکەن. چونکە پێشتر یەکەمجار لە تەڕەف شێخی عارەبانەوە مەرد چۆتە مەیدانێ و دواتر لە تەڕەف شێخی عارەبانەوە مەرد چۆتە مەیدانێ و دواتر لە تەڕەف وەزیری بەغدایەڕا مەرد هاتووە بەڵام ئەوجار پێشتر لە تەڕف وەزیری بەغدایەڕا مەرد هاتووە، برازاکەی شێخی عارەبان مووی لە قالبی دەبێتە پەیکان و سەر لەبەرگی وەدەردەنێ. دەچێتە بەردەرکی چادری مامی و دەڵێ مامە دەرپێن لەپێ داکەندرا، چەند ڕۆژە لە تەڕەف مەوە مەرد چۆتە مەیدانێ کەچی ئەوڕۆ لە تەڕەف قەحبەبابێکی وەک وەزیری بەغدایە مەرد هاتۆتە مەیدانێ.

مامی دەڵێ: ڕۆڵە نۆبەتێیەکم هاتۆتێ، ددانم ددانی ناگرێ. ئەویش دەڵێ: مامە، لاموکینە دەبێ دەگەڵ من سواربی و بێیە سەیری مەیدانێ، ئەمن دەیانکوژم و دەگەڕێینەوە.

دەڵێ: ڕۆڵە، وەرە پیاوی چابە ئەمن ئەوشۆ خەونێکم دیوە و خەونی منیش ڕاستە و هیچ درۆی تێدا نییە. ئەوشۆ دەخەوێمدا دوو کوڕی کوێستانی هاتبوون، ئەتۆیان کوشت و ئەمنیشیان بەدەست و پێ بەستراوی لەپێش وەزیری بەغدایە دانابوو.

برازاکەی دەڵێ: لاموکینە، ئەوەڵ ڕۆژێ ئەو قسەیەت بەمن گوتبا، هەستە سواربە. جا کە دێتە مەیدانێ و چاوی بەچاویان دەکەوێ لە پشتێند بەرەژێری دەمرێ، جا بانگیان دەکا و دەڵێ: پیاوی چابن ئەی نۆجەوان، حەیفم دێنێ بۆ وەزیری بەغدایەکی قەحبەباب ئەنگۆ بەدەستی من بەکوشت بچن ئێستاش وەرن چەند مەملەکەتی دەڵێن دەودەمێ، بۆ خۆتان ئاغایەتی خۆتانی لەسەر بکەن کوڕە، با بەدەستی من بەکوشت نەچن.

ناسر دەڵێ: ئەو قرکێنە چن دەیانلەی؟ دەڵێی ئەنگۆ هەڵێن، جا ناسر و ماڵ ماڵ هەڵدێن؟

کە ناسر وای جواب دەداتەوە، ئەوانیش دەکەونە سەریان. دەنیوەی مەیدانێدا ناسر وا بادەداتەوە و ماڵ ماڵ وا بادەداتەوە. ناسر ڕۆدەبێتە ڕمبی و لەبرازای شێخی عارەبانی دەدا، وای لێ دەدا بستێکی لەسەر سینگی وەدەردەنی و هەڵی دەدێرێ. هەرچی ماڵ ماڵیش دەبێ ئەگەر ڕۆ دەبێتە ڕمبی کە لە شێخی عارەبانی دا، دەڵێ: حەک حەمرت نەمێنێ ئەدی ئەتۆ چ قەرارێکت کرد. کە مەندی داوێتی تەتەر پێچی دەکا و شێخی عارەبان دێنێ لە پێش خۆی دادەنێ.

لەشکری وەزیری بەغدایەش ئەگەر دەزانن ناسر و ماڵ ماڵ سەرکەوتن بەلەشکری شێخی عارەبان دادەدەن و، وەک گەڵاڕێزانی هەڵیان دەوەرێن. ئەحمەد ئاغا کە ئەوەی دەبینێ، خەزا پیرۆزەیان لێ دەکا و دەڵێ: جا با بچینە کن وەزیری بەغدایە.

ماڵ ماڵ دەڵێ: چما دەبێ وەزیری بەغدایە بێتە کنە من یان ئەمن بچمە کنە وی؟ ناسریش دەڵێ: کوڕە ماڵت نەشێوێ بۆ هێندە گەوجیت؟ ئەتۆ شێخی عارەبانت گرتووە ڕەق و ڕووت لێرەت داناوە، چ کارت بە شێخی عارەبانە چی لێ بکەین؟ ئێمە ئەوڕۆ کارمان بەوەزیری بەغدایە چا دەبێ. جا ماینەکەی دەدا بەناسری و بۆ خۆی هەڵدەستێ دەچێتە کن وەزیری بەغدایە. وەزیری بەغدایە کڵاوی پادشایەتی لەسەری خۆی هەڵدەگرێ و لەسەر وی دەنێ بن پیلی دەگرێ و دەیبا لەسەر تەختی سەڵتەنەتی دادەنێ و دەڵێ: ماڵ ماڵ، ئەلحەقی ئەتۆ بۆ پادشازادە باشتری. ئەتۆ دانیشە پادشایەتی خۆت بکە و ئەمنیش دادەنیشم، کونجی قەناعەتێ دەگرم و نوێژ و تاعەتی خۆم دەکەم.

ماڵ ماڵ دەڵێ.. سەری وەزیری بەغدایەم خۆش بێ، ئەمن نە کڵاو و تەختی سەڵتەنەت و، نەملک و ماشم دەوێ بەڵام مامم گاگەش و گاگەشی لێ داگیر کردووم حەز دەکەم بۆ پاشەڕۆژێ کاغەزێکی تۆم پێ بێ، ئێستاش ئەگەر کەلیمە کاغەزێکم دەدەیەی چاکە دەنا دەچمەوە بەدەست و ڕمبی خۆم چم پێکرا، پێم کرا، دەنا با بکوژرێم. وەزیری بەغدایەش دەڵێ: جا ئەگەر ئەتۆ بەو کەس نەکێڵ و بەردەڕەقەی لەمن قایل دەبی ئەوە هەتا ئاشی «گاو و دەڵێم»یشم بۆ هاویشتیە سەری.

لەودەمەیدا شێخی عارەبان ئاخێکی هەڵدەکێشێ. ماڵ ماڵ دەڵێ: ها شێخ، ئەو ئاخەت بۆ هەڵکێشا؟ دەڵێ وەڵاهی ئەو ئاخەم بۆیە هەڵکێشا ئێستاش نەمزانی کە ئەگەر دەگەڵ ناسری تەقلێکی بکەن کێهەتان ئازاترن؟





ماڵ ماڵ دێتە خوارێ و دەڵێ: کاکە ناسر با تەقلێکی بکەین.

ناسر دەڵێ: کوڕە ماڵت نەشێوی ئەوە فەندە (فەننە) شێخ خەریکە بەکوشتمان دەدا، دیارە ئەتۆ هەڵێی ئەمن تەقلێکت لێدەم دەتکوژم. ئەگەر ئەمنیش هەڵێم ئەتۆ تەفلێکم لێدەی دەمکوژی، ئەوە فەندە با بۆ خۆی ئەگەر چ مەردی هەیە بابیهێنێتەوە مەیدانێ. ئێمە سوێندمان خواردووە پێکەوە تەقلەی لێ نادەین، ئەگەر چ مەردیشی نینە ئەوە خودا حافیز.

جا ماڵ ماڵ دەچتەوە و دەڵێ: شێخی عارەبان، ئێمە سوێندمان خواردووە پێکەوە تەقلە لێ نادەین. ئەتۆ ئەگەر چ مەردت هەیە با بێتە مەیدانێ دەنا ئێمە خودا حافیز.

شێخ دەڵێ: قولێکم هەیە، بچن قولەی بێنن.

ئەگەر قولەی دێنن سەرچەی هەر ڕەشە، وڵاغەکەی هەر ڕەشە و بۆ خۆشی هەر ڕەشە.

ناسر لە پشتێند بەرەژێریڕا دەمرێ، دەڵێ: ماڵ ماڵ باشاری ئەو سەگبابەی ناکا و بەری حەملێکی ناگرێ.

مەیدان ئامادەکرا، ماڵ ماڵ تێی دەخوڕێ و دەڵێ: حەملە. هەرچی وڵاغی ماڵ ماڵی دەبێ بەحرییە و، هەرچی وڵاغی قولەشە گۆڵە بارگینە. بەڵێ جا حاوی لێ دەکێشی دەگاتە نیوەی مەیدانێ، ماڵ ماڵ دەچێتە بن زگی وڵاغێ. هێندی لێ دوور دەبێ هەر بەدار تەقلەی پێ دەدا بەپلار قاڵتاغ و، قەڵتووکی وڵاغەکەی هەڵدەگرێ و دەگوێی ماینیدا ئاوا دەکا. ماڵ ماڵ وەبەرنایە، دەگاتە ئەوسەری مەیدانێ ئەوجار ناسر دەڵێ: بەسەری خۆم گراوێی وەبیر نەهێنمەوە، بێتەوە ئەو سەری مەیدانێ قولەی نەجاتی بدا، تازە ئەو نەجاتی نابێ ئەگەر بچێتە نێو زگی وڵاغەکەشی، هەر دەری دەهێنێتەوە. وا چاکە وەبیری بێنمەوە. جا دەڵێ:

ئەوڕۆ سەری من دێشێ ئەرێ بابەکەی بابم کاکە ماڵ ماڵ

دڵی من چەندی ئەوڕۆ لەمن لە گلی چەندی لەمن لە گلی گلییە

ئەرێ بابەکەی بابم ئەرێ پێم وابێ ئەتۆ وەبیرت نایە ئەگەر لە مێرگۆڵە و مێرگە نەخشینەی دەگاگەش و گاگەش با بۆمەرانمان جووتە گراویلکێکەی خۆ دەگەوزاندن

پێم دەشکاندن گوڵی هەڵاڵە و سوێسنی ناوەڵڵا لەمن دەگەڵ قۆپەنی دەشەنگەبیزایێ

ئەلحان ئەمن و تۆ لەسەر مرادین بچینەوە وڵاتەکەی دەگاگەش و گاگەش بابۆمەران

ئەگەر بێتو کار لە پێشێکی خۆت نەکەی دێتەوە نۆرە مەیدانی قولەی تازە قوتاریت

لەچنگی قولەی کازاب نایێ.

**

قولە هەڵدێ دەگاتە نیوەی مەیدانێ ئەگەر حاوی لێ دەکێشێ، قولە دەچێتە بن ورگی وڵاغێ و ڕێی نادا ڕمبی پێدادا. ماڵ ماڵیش پێیدا نادا و قولە دێتەوە سەرپشتی وڵاغێ. دیسان حاوی لێ دەکێشێ قولە دەچێتەوە بن زگی وڵاغێ، ئەوجار دەڵێ خێر لە مەیدانێ دەرچوو، دارتەقڵەی بەسەردا هەڵداوێ قولە دێتەوە سەرپشتی وڵاغێ. جا ماڵ ماڵ ڕمبێکی لێدەدا بەوڵاغەوە دەی دروێ و هەڵی دەتەکێنی و لەباڵێکی دەبا، ئینجا خوا حافیزی دەخوازێ و دەڕوا.

جا شێخی عارەبان ئاخێکی دیکە هەڵدەکێشی، وەزیری بەغدایە ڕووی تێدەکا و دەڵێ: ها، شێخ، ئەو ئاخەت بۆ هەڵکێشا؟

شێخ دەڵێ: وەڵاهی وەزیری بەغدایە خۆتۆ یان دەڵەی تیرەبارانی کەن، یان دەڵەی بەگازی گۆشتی لێ بکەنەوە یەکسەر بیکوژن، خۆ هیچی دیکەت لەدەست نایە بەرامبەرم بیکەی. فەقەت ئەتۆ ئەگەر لە دایکت بووی هەر بە دێڵی بووی، هەر بەدێڵیش ڕسکاوی.

وەزیر دەڵێ: بەدەلیلی؟

شێخ دەڵێ: بەو دەلیلەی ئەگەر ئەو جووتە سوارە نەبان ئەمن تەواوی مەملەکەتی تۆم بەتوورەکەی ئەسپان دەبردەوە مەملەکەتی خۆم. ئەو جووتە سوارە هاتن برازای منیان کوشت، دەست و پێی منیان بەست و لەپێش تۆیان دانام ئەتۆ ئەوەندەت جەوهەر نەبوو، ماینی من و ماینی تۆ خوشکن ئەگەر ماینی خۆت بدەی بەوی دیکەیان، هەتا لەسەر ماینی من یەکتر نەکوژن. حەیفە لە دونیایەدا ئەو جووتە لاوە لێک بن. لەسەر ماینی من یەکیان دەکوژێ و لێک دەبن.

وەزیری بەغدایە دەڵێ: بچن بیانگێڕنەوە. بەڵێ جا هەتا دەیانگێڕنەوە، ماینی ماینی وەزیری بەغداش ڕەخش ماینی شێخی عارەبان بوو کارامە دەبێ بەڵام ماینی وەزیری بەغدایە هەر دابەستراو دەبێ لە جوانیدا میسل و مانەندی نابێ. بەو جۆرە ماینی وەزیری بەغدایەش دەدەن بەناسری. جا ناسر بە ماڵ ماڵ دەڵێ: برالە سواری ماینی شێخی عارەبان بووی لێت مبارەک بێ دەنا ئەوە ماینی وەزیری بەغدایە کامیانت دەوێ ئەوڕۆ سەری شەرتانە، کوڕە دەنا لەو ڕۆڕا سواری ماینم بی دمت دەبڕم. ماڵ ماڵیش دادەبەزێ و سواری ماینی وەزیری بەغدایە دەبێ.





ناسر دەڵێ: نا، تازە خۆت گەوج مەکە ئەوە بوو بەوڵاغی تۆ، ئەمما ئەمن و تۆ قەرارێکمان دەگەڵ شێخی عارەبان کردووە بڕۆ بەری دە بەئاقڵی. ماڵ ماڵیش دەڵێ: بەخودای بەری دەدا چاکە دەنا دەرکێ عارەبانی دەبەم. هەر بەو نیازەی هەڵدەستێ دەچێتە کن وەزیری بەغدایە.

وەزیر دەڵێ: ها، ماڵ ماڵ چ نیازێکت هەیە؟ ئەویش دەڵێ: سەری وەزیری بەغدایەم خۆش بێ، شێخی عارەبان برازای کوژراە و مەملەکەتەکەی ئێستا چۆڵە، پێمان خۆش بوو ئەگەر بەری دەی بچتەوە مەملەکەتی خۆی دەڵێ: کوڕە ئاخر ئەوە گورگە لە پێستی مەڕیدا، چۆن بەری دەم؟ ماڵ ماڵیش دەڵێ: بۆ گاگەش و گاگەش هێندە لە تۆ دوورن، کەلیمە کاغەزێکم بۆ بنووسی کای لە پێستی سەری داخنم. شێخی عارەبانیش سوێندێ دەخوا و دەڵێ: وەزیری بەغدایە شەرتە بەشەرتی پیاوان هەتا قالبەندی تۆ دەمێنێ پشتا و پشتیشم تیغی لەڕووی تۆ نەکێشن. وەزیریش کە شێخ وا دەڵێ، بەری دەدا و دەچتەوە مەملەکەتی خۆی.

ناسر و ماڵ ماڵ بەرەو گاگەش و گاکەش بابۆمەران دەکەونە ڕێ، بۆ شەوێ دەگەنە خەندەکی وەزیری بەغدایە. لەوێ ماڵ ماڵ بەبێ خەمی بۆی دەنوێ، بەڵام ناسر دەڵێ: بەوەی نییە دوێنێ شەوێش نەنوستووم ئەو ماینانە هەریەکی خەراجاتی دونیا دێنێ، خۆ ئەگەر بێتو دز بیانبا یان گورگ بیانخوا، یان هەڵێنەوە بۆمە دەبێتە عەیبێکی گەورە نەوەڵاهی وا چاکە ئەو خۆی کەر کردووە ئەمن خۆم کەر نەکەم، با خزمەتی وڵاغان بکەم و ئابڕوومان نەچێ.

ماڵ ماڵ کە نووستبوو، خەون بەخاتوون وەدەبینێ. جا هەڵدەستێ و دەست پێدەکا:

ئەمن ئەوشۆکانە خەونێکم دەدییە خەونی من ڕاستە شتاقی درۆی لە بۆ نییە

ئەگەر لە خەوێدا لە من خاتوونیان دەددا بە کوردێکی کەڕکە دەبەری ناوەڵا لە من حەسڵ دەشارەزوورییە

خاتوون دادەنیشت لە لاپانکی تاوڵی دەمەزن بابۆمەر ئاغای بەدەستی دەیڕستەوە ڕانکوچۆغەڵەی دەکوردییە

بەزمانی دەیکرد سەڕافەتی عێلییە، بەلاقی لە من ڕایدەژاند کوڕی دەکوردییە.

**

ناسر پێی دەڵێ: دەرد و قوزەڵقورت، ئاخر هێندەی لەسەر یاد نوستووی بۆیە خەوی پێوە دەبینی، دڵت نەتۆقێ سبەینێ دەگەینێیە. ماڵ ماڵ دەنوێتەوە، ئیستێکی پێ

دەچێ دیسان هەڵدەستێ و بەهەردک دەستان بەئەژنۆی خۆیدا دەدا و جا دەڵێ:

بابەکەی بابم کاکە ماڵ ماڵ لەمن بانگ دیڵێ بەسەری تۆ ئەمن ئەوشۆ خەونێکم دەدییە

دەخەوێدا ئەمن خاتوونیان لەمن دەدا بەکوردێکی کەڕکە دەبەری حەسڵ لەوی دەشارەزوورییە

خاتوون لەمن دادەنیشت لەلاپانکی تاوڵێ مەزن بابۆمەر ئاغای مامم بەدەستی لەمن دەیپرستەوە ڕانکوچۆغەڵەی دەکوردییە

بەزمانی دەیکردەوە سەرافەتی عێلییە

بەلاقی لەمن ڕادەژاندەوە کۆرپەڵەی لەمن دەکوردییە

هەر کەسانێکی بێتو لە خەندەکەکەی وەزیری بەغدایە خەبەرێکی ئەسەح و مەعلوومی خاتوونم لە بۆ بێنی شەرت بێ ئەمن پیرەبابێکم هەیە دەیدەمێ کاغەزی لە گەرمێن و کوێستانانی لە بۆبێنی

پیرە دایکێکم هەیە ئەویشی دەدەمێ ئەگەر شەوێ لانکۆڵەی لە بۆ ڕابژێنی

خوشکێکی دەبچکەڵم هەیە ئەویشی دەدەمێ ئەگەر لەسەر جێگایە خەم و خەفەتێکی خۆی پێ بڕەوێنی

ناوەڵا ئەمن بەخودا برایەکی گچکەڵەم هەیە ئەویشی دەدەمێ ئەگەر لەسەری بۆڵ و ئاڵان بزانی کۆرپە بەرخە کۆرپەڵان دەبۆ بچەرێنی ماینی وەزیری بەغدایە ئەویشی دەدەمێ لە مزگێنی

ئەوە ناسر بانگ دیڵێ: کاکە ماڵ ماڵ دەزانم کەس لە خەندەکی وەزیری بەغدایە نییە بەگوێی کاکی خۆتی هەڵدێنی

ئەمن نەپیرە بابی تۆم دەوێ کاغەزم لە گەرمێن و کوێستانان لە بۆ بێنی

نەپیرە دایێ تۆم دەوێ ئەگەر شەوێ لانکۆڵەم لە بۆ ڕابژێنی

نەخۆشکێ بچکەڵەی تۆم دەوێ ئەگەر لەسەر جێگای خەم و خەفەتم بڕەوێنی

نە برای بچکەڵەی تۆم دەوێ ئەگەر لەسەر بۆڵ و ئاڵان بەرخە کۆرپەڵانم لە بۆ بچەرێنی

نە ماینی وەزیری بەغدایەم دەوێ لە مزگێنی





یان ئەوتانێ چوار پەلی ماینی شێخی عارەبی لە بۆ دەشکێم

یان ئەوەتانێ بۆ دووسبحەی نیوەڕۆیە خەبەرێکی ئەسەح و مالوومەی خاتوونێت لە بۆ دێنم.

**

ناسر دەڵێ: جا ماڵ ماڵ، ئەمن ئەوە دەڕۆم کوڕە بێتو ماینی وەزیری بەغدایە شتێکی لێ بێ کات دەپێستی سەری داخنم. ماڵ ماڵیش دەڵێ: شەرت بێ بەشەرتی پیاوان کاکە ناسر ئەمن نەهێڵم ماینی وەزیری بەغدایە هیچ شتێکی لێ بێ، ئەمما دەبێ ئەتۆش شەرتێکم دەگەڵ بکەی کە بەبێ من دەستنوێژت لەگراوێ خۆت نەشکێ. ئەویش دەڵێ: شەرت بێ بەبێ تۆ دەستنوێژم لەگراوێ خۆم نەشکێ.

ناسر ڕکێفی لێدەدا و دەڕوا، بەڵام لەبەر ئەوەی دوو شەو و ڕۆژان نەنوستبوو، خەو هێرشی بۆ دێنێ و لەسەر وڵاغی بالسکۆیە دەبا، دەڵێ وەڵاهی دابەزم، وا زوو وەخەبەر نایەم ناوەڵا هەر لەسەر وڵاغی شێخی عارەبان ئیستێکی دەگرم و دەڕۆم. ماینی شێخی عارەبانیش کارامە دەبێ چوار پەلان بڵاو دەکا و ڕوبی دەچەقێنێ و دەست داوێتەوە سەر چاوی. ناسر خەوی لێ دەکەوێ، فەسڵایەکی ئەگەر وەخەبەردێ بەتینی تاوێ پشتی گەرم داهاتبوو. بۆ خۆی بەخۆی دەڵێ: حەک عەمرت نەمێنێ وەڵا عەجەب خەبەرێکت هێناوە بۆ ماڵ ماڵی. ئەوجار ڕکێفی لێدەدا و دەڕوا، ئەگەر دێ دەگەڕێ دە مەم و زینیاندا، تەماشا دەکا کەرکە مەڕێک ئەوە لەوێ کەوتووە. بانگی کابرای شوان دەکا و دەڵێ: ئەرێ کاکە، نانێک مانێکت لە کنە؟ کابراش دەڵێ ئەرێ وەڵا نانم زۆر پێیە. جا کە نانەکەی بۆ دێنێ ناسر دەڵێ: وەڵاهی نانەکە زۆر ڕەقە، پیاوی چا بە ئەو مەڕە ڕەشەم بۆ بدۆشە تا ئەو نانەی تێبوکشم.

کابراش دەڵێ بابەگیان، کەیفت دێنێ هەتا تەواوی مەڕەکەت بۆ دوێ دەم با نەڵەی دڵی بەشیری مەڕەکەیەوەیە، بەڵام ئەو مەڕە مەڕی ناسری میرزا ئاغایە ئەوە حەوت ساڵە لەوەتی ناسر و ماڵ ماڵ چوونەتە وڵاتی گەرمێنێ ئەو مەڕە حەبڕەشە نەشیری دەگوانی دایە، نەبەرانی گرتووە. ناسریش دەڵێ: بەڵکو خودا ڕوحمێ بکا و مەڕە ڕەش شیری تێدابێ. کابراش ئەگەر دەچێ تەماشا دەکا مەڕە ڕەش پڕ بەنێو ڕانی گوانە بەخەجاڵەتییەوە شیری بۆ دەدۆشێ و، دێنێ لە پێشی دادەنێ.

ناسر کە نانەکەی خوارد ئەو جار دەڵێ: ئەدی کاکە ئەو مەڕەت بۆ لەو بەر ڕۆژەی قەدیس کردووە کەچی ئەو مەڕگەلەی دیکە لەو کوێستانەی شاش و بێش لێی دەدا؟

ئەویش دەڵێ: ئەوە مەڕی بابۆمەرئاغایە، ئەوەش مەڕی ناسر و ماڵ ماڵییە. ئەوساڵ حەوت ساڵە ئەگەر ناسر و ماڵ ماڵ چوونەتە وڵاتی گەرمێنێ، بابۆمەر ئاغاش کوردێکی هاتۆتە کنی خاتوونی کچی داوەتێ هەرچی پاشخوانی ئەو مەڕەی نەبێ ناوێرم وێی کەوم. لەسەر ئەو چۆمە زۆرەش ڕا هەتا ئەو مەڕە ئاوێ نەخواتەوە و، نەکشێتەوە ئەگەر ئەو مەڕە قڕیشی بێ ئەمن ناوێرم وێکەوم.

ناسر دەڵێ: دا هەستە ئەو مەڕەی پێوەنێ ئەویش بەغیرەتی ناسری مەڕەکەی پێوەدەنێت. کوردەش ئەوە لە بەندەنێڕا تەماشا دەکا لەو کاتەیدا مەڕێکی لێ گیا بڕ دەبێ چوارپەلی دەبەستێ و بەقەفی گۆچانێی دادەکا و بەشانی دادەدا، وردە وردە بەجنێودان دێتە خوارێ.

ناسر دەڵێ: هەی بەلاقی خێوێیەوە، وەڵا ئەوە ماڵ ماڵ باشاری نەکا قەت ئەمن باشاری ئەو سەگبابەی ناکەم، کورە چش قەیدێ ناکا با ئەو جەمەی لێیدا، بەو جەمەی نامرێ، کار لە دنیادا بەکەرێتی ناکرێ، وا چاکە بچم سڵاوێکی لێ بکەم. جا دەڵێ:

لەمن ناسر بانگ دێڵێ: سەلام و عەلێکم لەمن بەدەولەت بی کوردە

لەمن کوردەی لەبەر مەڕییە، ئەمن نازانم ئەو هۆبە و هەوارە ئی کێیە

لەمن هەڵیداوە لەو چۆڵ و بیابانەی

ئەوە کوردە لەمن بانگ دێڵێ: وەعەلێکمەسەلام و ڕەحمەتوڵاهی لەمن بەخێر نەدەهاتی حەیتە لەمن حەیتەی دەگەرمێنێ

هەرچەند ساڵێکی ئەگەر لە ژێڵڵاڕا دێن و بەپێوتانەوەیە قات و قڕی و نان گرانییە

خۆ تۆ حەرتک چاوت کوێرنەبووە نازانی ئەوە هۆبە و هەواری مەزن بابۆمەر ئاغایێ لەمن هەڵیداوە هەر لەو بەرەوبەری گاگەش و گاگەش بابۆمەری.

**

ناسر ئەوەندە گفتوگۆیەی دەگەڵ دەکا و، ڕکێفی لێدەدا و دەڕوا.

.......................................................... *

ئەگەر ماڵ ماڵە شۆڕی ئەدی ناسری میرزا ئاغات هەر لەمن چ دەکردییە

* لێرەدا لاپەڕەیەک لە دەستنووسەکە کەوتبوو، زۆر هەوڵمان دا پەیدای بکەینەوە، بەداخەوە دەستمان نەکەوت– ئاراس.





ئەوە ناسر لەمن بانگ دێڵێ بڕۆن دێڵە سەگی لەمن قەحپەی سوزمانی

بەخودای درۆیان دەکەن بەقای ژنان هەروایە

هەتاوەکو سەر بەقایان بۆ هیچ کەس نییە

ئەنگۆ پێم ئەو ڕۆژانەو، وەبیرنایە ئەگەر لە مێرگۆڵە و مێرگە نەخشینەی دەگاگەش و گاگەش بابۆمەرانمان سوێند دەخوارد بەحەمایەڵێکی دە سووڕەتی قورعانی

نە ئێمە، چ ژنان بێنین نە ئەنگۆ بکەنەوە چ مێردییە

لەنگۆ وایە سەری ناسر و ماڵ ماڵی بەقەڵایەکەی قالبێوە نییە

خۆتان دەبەر کوردێکی کەڕکە دەبەری، حەسڵە شارەزووری لەمن دەکردییە.

**

ناسر کە لەو گفتوگۆیەی دەبێتەوە، دەڕوا. ئەوانیش قەرەواشیان دەگەڵ دەبێ شتومەکەکانیان پێ دەشۆن و دەچنەوە. ئەویش وەک هەوەڵی دەوری پەهلەوی ئەگەر نێر و مێ، گەنج و پیر با هەر دایاندەپلۆسی وابوو.

مەزن بابۆمەر ئاغا بانگی میرزا ئاغای دەکا و دەڵێ: بزانە ئەو سەگبابە بۆچی وا لەو عالەمەی دەکا، ئاخر چی دەوێ؟

ئەویش دێ دەڵێ بابە بۆچی وا لەو عالەمەی دەکەی؟ دەڵێ: ئەو ساڵ حەوت ساڵە خەرجیتان بەدەوڵەت نەداوە، ئەلحانیش حوکمی سەختم پێیە، حەوسەد تمەنم بۆ تەحویل بدەن لە هەمبانەی بکەن و لەو حاستەی داینێن. دەنا دانابەزم.

مەزن بابۆمەر ئاغای لەو قسانە ئاگادار دەکەنەوە. جا دەڵێ ئەو سەگبابە هەر بۆ حەوسەد تمەنی وا لەو عالەمەی دەکات؟ دابچن لە میرزا ئاغا و مەزن ئاغای چوارسەد تمەنی بستێنن و بچن لە تاوڵی منیش سێ سەد تمەنی بێنن. کە حەوسەد تمەنەکەی دەبەن، دەڵێ بڕۆن بەمەزن بابۆمەر ئاغای بڵێن: هەتا ڕۆژ دەبێتەوە لامێردانم بۆ چۆڵ بکا و چاوم بەچاوی نەکەوێ. بەبابیشی دەڵێ هەتا ڕۆژ دەبێتەوە دەبێ خزمەتی وڵاغم بۆ بکەی. ئەویش دەچێتەوە دەڵێ: مەزن بابۆمەر ئاغا، عارەب دەڵێ: دەبێ لامێردانم بۆ چۆڵ کاو سبەینێ چاوم بەچاوی نەکەوێتەوە. بەمنیشی گوتووە کە دەبێ هەتا بەیانی خزمەتی وڵاغی بکەم و بۆی بلەوەڕێنم مەزن بابۆمەر ئاغاش دەڵێ: بەگۆڕی بابیەوە، ئەوەندەی ئەو لەمن بێزارە ئەمن سەد ئەوەندە لەوی بێزارم. ئەمن ئەوە لامێردانی بۆ چۆڵ دەکەم و ئەتۆش هەتا ڕۆژ دەبێتەوە خزمەتی وڵاغانی بۆ بکە.

ناسر ڕوو لە باوکی دەکا و دەڵێ: تۆ من ناناسیەوە؟ ئەمن ناسری کوڕی تۆم. ئەو حەوسەد تمەنەش بەرەوە دەگەڵ مامم لە خۆتانی داروبەش بکەن. بەمامیشم بڵێ: ماڵ ماڵ لە خەندەکی وەزیری بەغدایە لێم کەربووە ئێستاش خەونی دیوە هاتووم خەبەری بۆ بەرمەوە، ئەگەر چوو پێدەکرێ دەست درێژێکمان بۆ بکەن ئەگەر چیشو پێ ناکرێ ئەوە مەڕ و ماڵ و ڕەعێتێکی ئەگەر بەدەستانەوە ماوە خۆو کەنارگیر کەن کوڕە سبەینێ بگەڕێینەوە سەر مەزن بابۆمەر ئاغای، کای لە پێستی سەری داخنین. میرزا ئاغا هەڵدەستێ هەمبانەی بەشانی دادەدا و دەچتە کن مەزن ئاغای. مەزن ئاغا دەڵێ: ئەوە چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئەوە ناسری کوڕمە هاتۆتەوە. مەزن ئاغا دەڵێ: ئەدی ماڵ ماڵ؟ دەڵێ ماڵ ماڵ ئەوە لە خەندەکی وەزیری بەغدایە بەجێ ماوە، گوتوویەتی خەونم دیوە. ئێستاش ئەوە ناسر هاتووە خەبەرێکی بۆ بەرێ بەمنیشی گوتووە ئەگەر چوو پێدەکرێ دەست درێژێکمان بۆ بکەن، ئەگەر ناخۆو کەنار بگرن. سبەینێ دێینەوە و کای دەپێستی سەری بابۆمەر ئاغای داخنین.

مەزن ئاغا دەڵێ: بەگۆڕی بابیانەوە، تازە ئەمن خۆ پیاو خەراپ دەکەم لەسەر کوڕان؟ ئەگەر بۆ خۆیان کوڕ بن با ملکی خۆیان بستێننەوە، ئەگەریش کوڕ نین، ئەوە بەگۆڕی بابیانەوە.

بابێینەوە سەر نەقلی ناز و نازدار و خاتوونێ:

ناز دەڵێ: وەرە بابچین کچێ، ئەگەر عارەب بێ دەخەوێشدا ئەو کارەی دەگەڵ بکەی وەخەبەر نایە، ئەگەر عارەبیش نەبێ ناسر و ماڵ ماڵن و لێمان وەجواب دێن. جا خاتوون کوڕی کوردەی دێنێتە پشت لامێردان و بەندێکی بەکوڕی کوردەی هەڵدەڵێ:

ئەوە بابەکەم بنوو ڕۆڵە بنوو دەچبکەم بنوو دەتکەمەوە بەقوربانی سەری ئەوان جووتە سوارەکەی ئەگەر ئەو ساڵ حەوت ساڵە لەسەر ئەمن و تۆی قەلەندەری دەبابان وێرانێ دەخۆنەوە ئاوێ لەمن تاڵ و سوێرە

ئێستاش خەتای من نەبوو لەلایەکی باب لێم ڕادەسا بەشیرێکی دەلاهورێ دایک لێم ڕادەسا بەکۆڵەوەژێکی دەنانییە

برای دەگچکە لێم ڕادەساوە بەخەنجەری دەڕووتییە

هەتاوەکونێ مارەیان دەکردم و لە کوردێکی کەڕکە دەبەری حەسڵە لەوی شارەزوورییە

ئەوە ناز لەمن بانگ دێڵێ بڕۆ دێڵە سەگی قەحپەی سوزمانی بەخوڵای درۆیان دەکەی ئەو قسانەت ڕاستیان بۆ نییە





بۆچی هەوەڵێ باب لەمن ڕادەسا بەشیرێکی دەلاهورییە

دایک لێم ڕادەسا بەکۆڵەوەژی دەنانییە

برای دەگچکە لێم ڕادەسا بەخەنجەری دەڕووتیە

هەتاوەکونێ مارەیان دەکردم لە کوردییە

دەمگوت بەخودا و بەپێغەمبەری ئەمن جوانیم دەگەڵ ناسری میرزاغایە شەرت بێ ئەمن لەسەر ناسری میرزاغای بهۆنمەوە پرچۆڵەی لەوی دەسپییە

ئەوە ناسر لەمن بانگ دێڵێ بڕۆن دێڵە سەگی قەحپەی سوزمانی بەقای ژنان هەروایە

هەتاوەکونێ سەر بەقایان بۆ هیچ کەس نییە

ئەنگۆ ئەو ڕۆژانە و، وەبیرنایە ئەگەر لە مێرگۆڵە و نەخشینان سوێندمان دەخواردەوە بەحەمایەلی دەوێ دەسوڕەتی قورعانێ

نەئێمە بێنین چ ژنان نەئەنگۆ بکەنەوە چ مێردییە

لەنگۆ وایە سەری ناسر و ماڵ ماڵی بەقەڵایەکی قالبێوە نییە

خۆتان دەبەر کوردێکی کەڕکە دەبەری حەسڵە شارەزوورییە

لەمن دەکردێ ئێستاش وەرنە ئەو دیوەی ئەو شەڕە مەتەڵۆکە هەر لە من فایدەی نییە.

**

جا هەرچی خاتوون دەبێ دێتە زاری لامێردانی و هەرچی نازێش دەبێ هەر سووچێکی لێفەی بڵێند دەکا و خۆی دەبن ڕادەکا خۆی داوێتە باوشی ناسری. ناسر دەڵێ: پیاوی چا بەدەستنوێژم دەشکێ. ئەویش دەڵێ بۆ لێمان پەشیمان بوویەوە؟ دەڵێ ناوەڵا، هەتا دنیا خەرادەبێ لە تۆ پەشیمان نابمەوە، ئەمما ماڵ ماڵ لە خەندەکی وەزیری بەغدایە سوێندێکی داوم کە دەستنوێژم لێت نەشکێ و دەستم وەدەستت نەکەوێ، با سوێند نەمگرێ. خاتوون لەولای ڕادێ، دەڵێ دەستم بەدامێنت ناسرخان، ماڵ ماڵ کەرە ئێستاش ها ئەوە بەرو بەرمووری منی بەیادگارانە بۆ بەرەو بڵێ خاتوون گوتوویەتی ئەمن هەرگراوێ ئەویم و، ئەویش هەر گراوێ منە و بۆ تاقە شەوێکیش دەست لە گراوی خۆم هەڵناگرم. ناسریش دەڵێ: خاتوون ئەمە بەجوملەی حەوت ساڵان کە ڕۆیشتووین چمان بۆ نەکراوە بەو تاقەشەوەش هیچمان بۆ ناکرێ. خودا دەزانێ دوو شەوە نەنوستووم و ئەوە کوێر دەبم هەستن بڕۆن.

ناسر دوا بەدوای ئەوان لێی دەنوێ، نێوانی شەو و ڕۆژان بابی لەولایڕا دێ، جا دەڵێ: بابەگیان بچۆ مزڵی بابۆمەر ئاغای بلێ عەرەب دەڵێ پیاوێکم دەگەڵ خا بۆ بەڵەدی ڕێیە. ئەویش دەچێ پێی دەڵێت و بابۆمەر ئاغاش پیاوێکی بۆ دەنیرێ. لەو دیوی ماڵان ناسر لێی دەگەڕێتەوە و هەردووک گوێیانی هەڵدەقەنی و دەمستی دەنێ، جا دەڵێ برۆ بۆ مەزن بابۆمەر ئاغای مامم بگێڕەوە بلێ ئەوە ناسری برازات بوو، عەرەب نەبوو. ئێستاش با بۆ پاشەڕۆژێ نەڵێ بەدزیم هاتنەوە سەری، چی پێدەکرێ وەخۆکەوێ دەنا کای دەپێستی سەری داخنم.

کابرا کە لەولاێڕا دێتەوە بەچۆڕەچۆی خوێنێ، دەڵێ کوڕە ئەوە بۆچی وای؟ کابراش دەڵێ: ئەوە ناسری برازات بوو هیچ عەرەب نەبوو گوتیشی بۆ سبەینێ نیوەڕۆیە دەگەمەوە سەری و کای دەپێستی سەری داخنم، چی پێدەکرێ بیکا. دەنا نەڵێ بەدزیم هاتنەوە سەرێ.

بابۆمەر ئاغاش دەڵێ: هەی بەگۆڕی بابیەوە، ئەوە ڕێم نەدا بۆیە وا دەڵێ. ناسر ڕکێفی دێنیتێ و دێ، ئەگەر تەماشا دەکا ماڵ ماڵیش ئەوە چاوێکی لەسەر سەعاتێیە و چاوێکی هەر لە ڕێگایەیە. تەماشا دەکا ناسر تەپوتۆزی دیارە بەڵام یەک دوو دەقیقەی لەو جەنگەی کە بۆی داناوە بگەڕێتەوە لاداوە، ماینی وەزیری بەغدایە بەرەڵلا دەکا و بەسەری ڕووتی بە ڕەڵمێدا دەڕواتە خوارێ.

ناسر دەڵێ: ئەو سەگبابە دیسان خۆی کەر کرد ئەمن چبکەم ناوەڵاهی با ئەمنیش بڕێک خۆ کەر کەم، بزانم بە کەرەکەرە دنیا چۆن دەبێ. هەر بۆیەش کە دەگاتە وێ خۆی فڕێدەدا، سەری ڕووت دەکا و بەپێی پێخواسی بەڕەڵمێدا دەڕوا، دەڵێ کوڕە سەگباب ئەتۆ خۆت خنکاند ئەمن خۆم بۆ دەخنکێنم ئێستاش ئەگەر بڕوایە ناکەی گراوێ منە و گراوی تۆ نییە ئەوەش بەروبەرمووری خاتوونێ. ماڵ ماڵ دەگەڵ چاوی بە بەروبەرموورەکانی خاتوونێ دەکەوێ لە قاقای پێکەنینێ دەدا و بەروبەرموورەکانی لێ وەردەگرێ و، دەباخەڵێیان دەنێ. بەجووتە سوارە لێی سوار دەبن هەتا دێنە ئەو جێیەی کە مەڕەکەی لێ کەوتووە. بەکابرای شوان دەڵێن، ئەرێ نانێک مانێکت لەکنە؟ کابراش دەڵێ: ئەرێ وەڵا نانم زۆر لەکنە. کە نانەکەیان بۆ دێنێ، ماڵ ماڵ دەڵێ: بابەگیان تەماشا، ئەو مەڕە شاش و بێش لە دڵی ئەو کوێستانەی دەدا ئەتۆ ئەو مەڕەت بۆ لەوبەر ڕۆژەی قەدیس کردووە؟ ئەویش دەڵێ: بابە ئەوە مەڕیی مەزن بابۆمەر ئاغایە، لەوەتی ناسر و ماڵ ماڵ کە حەوت ساڵە چوونەتە وڵاتی گەرمێنێ، کوردێکی هاتۆتە کنێ. ئەوی پاشخوانی ئەو مەڕەی نەبێ ئەمن ناوێرم وێی کەوم، لەسەر ئەو چۆمە زۆرەی





گاگەشیڕا هەتا مەڕی وان ئاوێ نەخواتەوە ناتوانم ئەو مەڕەی ئاودەم ئەگەر قڕیش بێ لەتینوان. جا بە ناسری دەڵێ: ئەدی ئەتۆ ئەو درۆیەت بۆ کرد بۆ دەڵەی گراوی تۆ نییە و گراوی منە ئەوە لە ترسی کوردەی وا دەڵەی؟ دەڵێ هەستە ئەو مەڕەی بەئاوێ وەنێ. هەتیو هەڵدەستی مەڕێ بەئاوێوە دەنێت.

کوردە لە بەندەنێڕا چاوی پێدەکەوێت، دەڵێ: ئەمن دوێنێ چەندم لەو هەتیوەی دا، ئەوە ناسر و ماڵ ماڵن. جا لەسەرڕا بەجنێودان دێتە خوارێ.

ناسر دەڵێ: کوڕە بەفەند (فەن) نەبێ باشاری ناکەین، پیاوی چابە ماڵ ماڵ ئەتۆ لێی وەپشتەوە کەوە ئەمنیش لە پێشەوەڕا بۆی دەچم، چی بەماڵی دنیایە پێمان کرا، کرا دەنا خودا دەزانێ سەر و قونمان لەکن یەک دادەنێ. ئەویش دەڵێ قەیدی نییە.

جا ناسر بەرەو ڕووی دەچێ و دەڵێ:

سەلام و عەلێکم لەمن بەدەوڵەتی کوردە لەمن کوردەی لەبەر مەڕییە

ئەمن نازانم ئەوە هۆبە و هەواری کێیە لەمن هەڵیداوە هەر لە چۆڵ و بیابانیە

دەڵێ وەعەلێکمە سەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی لە من بەخێر نەدەهاتی

لە من حەیتە حەیتەی لە گەرمێنێ، خۆ تۆ هەردووک چاوت کوێر نەبووە نازانی ئەوە هۆبە و هەواری مەزن بابۆمەر ئاغایە

لەمن هەڵیداوە لە بەرامبەری گاگەش و گاگەش بابۆمەرییە

بەخودای دەزانم ناسر و ماڵ ماڵن ئێستاش ئەو پێچ و پەنایە لەمن فایدەی نییە

ئەوە ناسر لەمن بانگ دێڵێ لەمن کوردەی لەبەر مەڕییە

وەرە پیاوی چابە ئەتۆ بەلەبزێکی خۆشمان خاتوون بۆ تەڵاق بدە شەرت بێ ئەمن بتدەمێ سەد شەکی ئەوی دەبەر بەرانییە

بتدەمێ سەدگامێشی دەوی پەل سپییە

بتدەمێ لایەکی دەگاگەش و گاگەش بابۆمەرانیش ساڵێ بیخۆ بە ئاغایەتییە

ئەگەر بێتو بەلەبزێکی خۆشمان خاتوون لە بۆ تەڵاق بدەی بتدەمێ ماینێ شێخی عارەبان هەموو ئێواران و سبەینان لێی سواربە و، لێی بکەوە تەقڵە و لەمن ڕمبازییە

ئەوە بابەکەی بابم کوردە لەمن بانگ دێڵێ بەسەری تۆ ناسر نەهێندە شوانێکی چاکم بەخێوکەم سەد شەکی دەبەرانییە نەهێندە

گامێشەوانیشم بەخێوکەم سەد گامێشی دەوی پەل سپییە

نەهێندە ئاغایەکی نێو بەدەرەوەم سالّی لایەکی گاگەش و گاگەشان بخۆم بەئاغایەتییە

نەهێندە سوارێکی چاک و تەڕدەستم هەموو ئێوارە و سبەینان سواربم لەماینێ شێخی عارەبی پێ بکەمەوە تەقلّە و ڕمبازییە

بەسەری تۆ مالّ مالّ ئەمن ئەو وەختانەم پێ چاکترن ئەگەر نیوەڕۆیە خاتوون نانم بۆ دێنێ ئەمن ماچێکی لە کۆلّمەی ڕاستەی خاتوونێ دەکەم دەلّێم بەکوێری چاوی دەکاکە مالّ مالّییە

بەسەری تۆ ناسر ئەتۆش دلّت بەخۆت نەمێنێ دەچبکەم گەلێکم قازی و مەلا و فەقێ دەرکردن ئەگەر مارەی نازێشم لێ نەدەهات دەنا ئەویشم مارە دەکرد هەر بەکوێرایی چاوی دەکاکە ناسرییە.

**

جا ئەکە ئەو قسانەی دەگەلّ دەکا مالّ مالّ ڕقی هەلّدەستێ و، ئەگەر ڕمبێکی لێ دەدا بستێکی سەر لەسینگی وەدەر دەنێ.

ناسر دەلّێ: مالّ مالّ هەی مالّت شێوێ، دەست دەکەن بەهەلاّتنێ. کوردە بەگەرمە برینەوە لێیان ڕاست دەبێتەوە و پلارێکیان ڕێ دەهالّێنێ، ئەوجار لێی دەگەڕێنەوە بەڕمبان شڕی دەکەن. هەتیوی برای مالّ مالّیش ڕۆ دەبێتە گۆچانی و مەڕی مەزن بابۆمەر ئاغای ڕەگەلّ مەڕی خۆی دەخا و دەلّێ با جارێ مەڕەکەم لێرەبێ.

شوانی بەرخانیش بەغار هاوارێ دەباتەوە دەلّێ، بابە، ناسر و مالّ مالّ هاتنەوە کوردەیان کوشت و ماتیان بەدیل گرت. هەتا ئەو چەند و چوونەی دەکەن ئەو لەشکر و سپایەی کە وەزیری بەغدایە دەگەلّی ناردبوون گەیشتنەجێ.

کە لەژێلّلا پێ هەلاّ دەچن تەماشا دەکەن کوردێک لەسەرڕا دێتە خوارێ، سواری کەرێکی گوێ لەق بووە و شیرێکی لاهوری و زوورێکی پێیە جارێک ڕەو دەمی دەخا و جارێک ڕەو دەمی دەخا. جا دەلّێ ئەولایەی ناسرۆکەی پێ دەکوژم و ئەولایەی مالّ مالّۆکە.

مالّ مالّ دەلّێ: کاکە ناسر ئەوە کێیە؟ دەلّێ کوردە ئەگەر چ بابی هەبن ئەوە بابیەتی و، دەچی دەلّێ مامەگیان ئەوە دەچیە کوێ؟ ئەویش دەلّێ: ناسرۆکە و مالّ مالّۆکە هەن لە ولاّتی گەرمێنێ هاتوونەوە دەگەلّ کوڕم بەشەڕ هاتوون دەچم ئەولایەی ناسرۆکەی پێ





دەکوژم و ئەولایەش مالّ مالّۆکەی.

کە کابرای کوردە وا دەلّێ، ڕمبێکی لێدەدا بەکەرەکەیەوە دەیدروێ و لە بالّێکی دەبا.

جا لەژێلّلا پێدا دێن، مەزناغای بابی مالّ مالّی بانگیان دەکا و دەلّێ:

ئەرێ جووتە لاوەکەی دەبەر مالاّندا دەکەنەوە هێلاّن و گێلاّنە

ڕەبی سەری باب و مامێکە خۆتان دەکەمەوە بەقوربانی لەمن قەفی دەسمێلاّنە.

لە خۆت تویا لمبۆزی ڕدێن شینی مامو خۆی لێ کێشاون دەخەندەکێ لە پاشڕا لێتان نەکاتەوە چ پەند و هەر لە من چ فێلّە.

**

کە تەماشا دەکا مامی لەنێو خەندەکێ خۆی مات کردووە تا لە پڕ پێیان دادا بەیەکجاری مامیشی جووت دەکا. جا ئەگەر مامی جووت کرد، لە مندالّییەوە مالّ مالّ ئەوەندەی ئاقلّ بەمێشک دادێ کە دەلّێ: کاکە ناسر ئەوە کوڕی کوردەیە خاتوون بەئامێزێوەی هێناوە و دەلّێ پیاوی چابە مەیکوژە چکۆلەیە، خۆ ئەمیش کوڕی کوردەیە ئەگەر ببێتە کوڕێکی چاردە سالّە سەبارەت بە چاوی خاتوونێ ناوێرم هیچی پێ بلّێم. ئەمما کوڕە ئەوە مارە لە پاشەڕۆژێدا پێمان وەدەدا، بۆت داوێم ئەگەر بۆی هێنام ئەتۆش بەزایەی مەدە، دەلّێ زۆر چاکە.

جا خاتوون لەولایڕا دێ و دەلّێ: وەرە پیاوی چابە ئاوری جگەریە مالّ مالّ مەیکوژە.

ئەویش دەلّێ: شەرت بێ بەشەرتی پیاوان دەیکوژم بۆم باوێ، بەلّێ کوڕەکەی لێ وەردەگرێ و ئەویش بۆ ناسری داوێ دەلّێ کاکە ناسر ئەمانەتی خاتوونێیە، کوڕە عەزیەتی مەدە.

ناسر دەلّێ بۆم باوێ، کە بۆی داوێ نووکی شمشێری وەبەر دەدا وەک چلّمەلەتەی پێیدا شۆڕ دەبێتەوە. لەو نێوەیدا ئەوی دەمێنێ تەنیا کوڕە کەچەلّەیە. لەقسان لە تایفەی خۆیان نییە، یان لە تایفەی ژنێ مەزن بابۆمەر ئاغایە یان لە تایفەی کوردەیە کە کوڕێکی کەچەلّی شەلەیە و تەمری لەنگی پێ دەلّێن. ئەویش هەشت نۆ سالاّن چۆتە بەر گوێلکان و بەر بەرخان هەتا دەستی ڕاست و چەپی خۆی دەناسێ. لەقسان دواتر دەچێتە تارانێ و لەوێ دەبێتە مەیتەر. لە مەیتەریڕا دەبێتە میرئاخوڕ، لە میرئاخوڕیڕا هەتا دەبێتە ڕەئیسێکی نێو بەدەرەوە. جا لەشکر و سپایەکی زۆر ڕەگەلّە خۆی دەخا. لەقسان ئەو قەلاّی یەلّ تەمرێ «روستای ایل تیمور»ی لێ نووسراوە چەندی لەشکر

دەگەڵ دەبێ تورەکەرێژ ئەو قەڵایەی ساز دەکا وردە وردە لە ژێلّلا دێن هەتا دەگەنە گەرمی دەمامەزییان، جا ئەو دەمی خەبەر دەدا فلانەکەسم و دێمە دیدەنیان. بەڵام ئەگەر چەکیان بێنن نابێ.

هەرچەندە ناسر دەڵێ: کوڕە ماڵ ماڵ ئەوە فەندە (فەنە). ماڵ ماڵ دەڵێ: کوڕە فەندی ئەو سەگبابەی چییە، جا هەتا ئەو چەند و چوونەی دەکەن ڕدێنیان سپی دەبێ و کۆم دەبنەوە.

جا کە ئەوان لەسەررا دێنە خوارێ بەخەنجەرەوە، ئەوانیش لەژێلّلا لەشکریان هەڵدەستێ هەتا دەگەنە ڕاستی شەکر بەگی. ئیدی ئەگەر تەماشا دەکەن چەکیان پێ نییە حاویان لێ دەکێشن. چی بەخەنجەرێ پێیان دەکرێ دەیکەن دەنا یەکیان لەوبەری دەکوژرێ و یەکیان لەوبەری.





## ناوەڕۆک

# چاپکراوەکانی دەزگای ئاراس لە ساڵی ٢٠٠٢دا

(١) مذكرات بنڤنوتو چلليني. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٢) المجتمع الكردي في المنظور الإستشراقي. تأليف: د. بدرخان سندي.
(٣) مارەكەیان بکوشتایە. ڕۆمان: یەشار کەمال. وەرگێڕانی: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل.
(٤) سەردەمی بێ تاوانی. شانۆنامە. دکتۆر قوتبەدین سادقی. وەرگێڕانی لە فارسییەوە نەجیبە ئەحمەد
(٥) كركوك في العصور القديمة. الدكتور جمال رشيد أحمد.
(٦) نامەکانی مەم. محەمەد مەولوود مەم.
(٧) نووسین و پەخشان و وەرگێڕاوەکانی گۆران. ئومێد ئاشنا- کۆی کردووەتەوە و ڕێکی خستووە و پێشەکیی بۆ نووسیوە.
(٨) ماڵئاوایی لە چەک. ڕۆمان. ئێرنست هێمنگوای. عەبدولخالق ئەحمەد عەزیز لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بەکوردی.
(٩) سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێلا Santiago De Compostela -ڕۆمان. فەرهاد پیرباڵ.
(١٠) مەلی ئاوات. سێ شانۆنامە. وەرگێڕانی: محەمەد فەریق حەسەن.
(١١) فەرهەنگی خەم. سەرجەمی شیعرەکانی. حەسیب قەرەداخی-بەرگی یەکەم.
(١٢) فەرهەنگی خەم. سەرجەمی شیعرەکانی حەسیب قەرەداخی-بەرگی دووەم.
(١٣) ساڵنامەی کوردستان-دەزگای ساڵنامەی کوردی. پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین.
(١٤) الجبل والسهل - قصص قصيرة. محي الدين زەنگەنە.
(١٥) كوردستان العراق-آراء ومواجهات إعلامية بقلم: فوزي الأتروشي.
(١٦) مستەفا بارزانی لە هەندێک بەڵگەنامە و دۆکیومێنتی سۆڤیەتیدا ١٩٤٥-١٩٥٨ (تۆمارێکی زێڕین لە مێژووی گەلی کورد). د. ئەفراسیاو هەورامی.
(١٧) تحولات. ناصر يوسف.
(١٨) کوردستان لە ساڵی ٢٠٠١دا. (چالاکییەکانی کابینەی چوارەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠١دا). ئامادەکردنی: بەدران ئەحمەد حەبیب + هەڵمەت حەمید.
(١٩) کوردستان: دیوانا شێخ مەمدووحێ بریفکانی. ئامادەکردنی: زاهد بریفکانی.
(٢٠) زمانێ کوردی: دیوانا شێخ نوورەدینێ بریفکانی. ئامادەکردنی: زاهد بریفکانی.



(٢١)دیدارێ یار: دیوانا شێخ شەمسەدینێ قوتبێ ئەخلاتییێ بریفکانی. ئامادەکردنی: زاهد بریفکانی.
(٢٢) وفادة الى المنطقة المحررة. رواية وثائقية. يونان هرمز.
(٢٣) نناشد صلاح الدين... أم نحاسب أنفسنا؟ إستجواب قائد بعد ثمانمائة سنة. حوار مع الأستاذ الدكتور مُحسن محمَّد حُسَين. أجراه: بدران أحمد حبيب
(٢٤) يقظة الكرد. جرجيس فتح الله.
(٢٥) گەڕان بەدوای نەمرییدا. مەولود ئیبراهیم حەسەن.
(٢٦) حملة الأنفال في كردستان العراق. تدمير قرية كوريمي. ترجمة د. رزگار.
(٢٧) شیعری ئینگلیزی. بەرگی یەکەم: شیعری سەدەی بیستەمی بریتانیا. هەڵبژاردن و وەرگێڕان: ئومێد وەرزەندە، بەختیار سەجادی.
(٢٨) دیاردەگەرایی تاراوگە. ڕێبوار سیوەیلی.
(٢٩) ئاراس پەڕینەوەیە بەرەو سەرفرازی- ڕۆشنبیران کارەکانی دەزگای ئاراس هەڵدەسەنگێنن.
(٣٠) الحديقة الناصرية في تاريخ وجغرافيا كردستان. علي أكبر كردستاني. ترجمة: جان دوست.
(٣١) کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی - کەشکۆڵی عەبدولفەتاح - لێکۆڵینەوەی: محەمەد عەلی قەرەداغی. بەرگی پێنجەم.
(٣٢) ئەوێستا - نامەی مینەوی زەردەشت. وەرگێڕی بۆ کوردی: عومەر فاررووقی.
(٣٣) مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی دووەم. دوکتۆر مارف خەزنەدار.
(٣٤) احداث عاصرتها. الجزء الثاني. ذكريات السيد محسن دزەيي.
(٣٥) الفيدرالية والديمقراطية للعراق: الدكتور: محمد هماوەندي.
(٣٦) چیرۆک و بەیتی کوردی. کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: عەزیز شارۆخ.
(٣٧) بەرهەمی خەبات. بەشێک لە بەرهەمەکانی ا. ب. هەوری (ئەبوبەکر شێخ جەلال).
(٣٨) عێراق و دەوروبەری - کورد لەو چەقەدا: سامی شۆڕش.